

ئافرەتێکــی تەنیا
فرۆغ فەڕڕوخزاد
ژیان و هەڵبژاردەی هۆنراوەکانی
گۆڕینی
د. ناصح قەرەداخــی
٢٠٠١

# ئافرەتێکی تەنیا

ژیان و

هەڵبژاردەی هۆنراوەکانی

# فروغ فەڕڕوخزاد

گۆڕینی: د. ناصح قەرەداخی (ئارام قەرەداخی)

هەولێر ٢٠٠١

## ناوەرۆك

# پێشەکی

فروغ واتە بە ١٧ ساڵی لە پەنا دیواری هەرزەکاریدا دەست پێکردن، ناکامی پێشوەخت و ئەسیری شەیدایی بوون، یاخی بوون لە ژانی دابڕان و ژیان لە سێبەری ئارەزووە هەڵکشاوەکانی تەنیاییدا، لەدایك بوونێکی تر لە ٣٠ساڵیدا و گەیشتن بە لوتکەی وەهمی سەوزی شیعر، ماڵئاوایی لە خێرایی تێپەڕبوونی زەماناو گەیشتن بە دەمی ساردی مژەری گۆڕ لە ٣٢ ساڵیدا پێش ئەوەی لە مەنزڵگای پەرییەکی خەمگینەوە بگاتە سەرەتای وەرزی سەرماو وشە تەزیوەکان لە کوانووی خەیاڵی داگیرساویدا بکات بە دەزووی شیعرەوەو ملوانکە تازەکەی پێشکەشی شاعیرانی حەپەساوی سەردەمی خۆی بکا، تا جارێکی تر تاقانەیی و بلیمەتی ئەو ئافرەتەیان بۆ ئیسپات بکاتەوە کە لە تەمەنێکی کورتا توانی کاریگەرییەکی درێژخایەن لەسەر ئەدەبیاتی ئێران بەجێ بهێڵێ.

تەنیا ئافرەتایەتی فروغ و تایبەتمەندێتی شیعرەکانی نەبوون بەهۆی ئەوەی فروغ وەك بلیمەتێکی سەردەمی خۆی پەنجەی بۆ رابکێشرێ. ناکامی ژیانی تایبەتی و کورتی تەمەن و زۆری بەرهەم و یاخی بوونی فیکری و کارکردن لە بوارەکانی تری هونەردا، هەموو ئەمانە فروغیان کردووە بە ئەفسانەیەك کە هێشتا تێگەیشتنی ئاسان نیە.

خوێنەری کورد زیاتر فروغ وەك فروغی لەدایکبونێکی تر دەناسێ، واتە فروغی لوتکە بەڵام فروغ پازدە ساڵ و سێ دیوانی پێچووە تاگەیشتووەتە ئەو قۆناغە. ئامانجی ئەم کتێبەش ناساندنی فروغە وەك ٣٢ ساڵ ژیان و پازدە ساڵ ئەزموونی شیعر. هەر بۆیەش ئەو هۆنراوانەی هەڵبژێردراون هەر پێنج دیوانەکەی

دەگرنــەوە هەرچــەندە لەبــەرهۆی ئاشــکرا زۆربــەی هۆنراوەکــان هــی دیــوانی (لەدایکبوونێکی تر) و ( باوەربێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما) ن.

لەگــەل پاراســتنی گیــانی هۆنراوەکانــدا هــەوڵ دراوە جەستەشــیان، تــا ئەوەندەی لەتوانادابێ ، وەك شیعری فروغ بپارێزرێ، واتە شیعرە عەموودییەکان بە عەموودی تەرجەمە کراون و لەهەموو حاڵەتێکدا هــەوڵ دراوە مۆسـیقای هۆنراەکـان پارێزراوبێ. ئەمـەش بـەلای منـەوە باشـترین شـێوەی تەسـلیم کردنـی ئەمانەتـە بـە خوێنەر ئەگینا چۆن بزانێ فروغ چۆن دەستی پـێ کـردووە و بەچـی گەیـشتووە لـە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ دارشتنی وشە و مۆسیقای شیعرەکانیدا.

رەنگە زۆر لەم هۆنراوانە پێشتر تەرجەمەکرابن، بەڵام تەرجەمەی شیعر وەك بابەتی تر نیە و سەلیقەی وەرگێڕ جیاوازییەکی زیاتری تێدا دروست دەکا. مەرجیش نیە ئەوانەی ئەم کتێبە باشترین تەرجەمە بن، گرنگ ئەوەیە یەك دەستەن و و یەکدەستن و ئاشنایی یەکی یەکپارچەتر دەربارەی فروغ دەخەنە روو.

د. ناصح قەرەداخی

٢٠٠٠/١/١٣

هەولێر

## فروغ لە قەڵەمڕەوی شیعر و ژیاندا[1]

**بە پێنووسی بیهروزی جەلالی**

مەزن بوو
خەڵكی ئەمڕۆ بوو
هاوپەیوەند بوو لەگەڵ گشت ئاسۆ واڵاكان
لە ئاوازی ئاوو زەویش چەند بە باشی تێدەگەیشت [2]

فروغی فەرروخزاد رۆژی ١٣١٣/١٠/١٥ ی كۆچیی هەتاوی( بەرامبەر ١/١٥/ ١٩٣٥ ز) لە جیهانێكدا چاوی هەڵهێنا كە جیهانی ئەو نەبوو، دنیای ئەو نەبوو، دنیای خەڵكی تر بوو كە چارەنووسی ئەوو هاوزەمانەكانی ئەویان دیاری دەكرد. منداڵیی فروغ لە خێزانێكدا بەسەر چوو كە كە بەهۆی ئەوەوەی كە باوكی سووپایی بوو ژیانی خێزانەكەی ئاوێتەی زەبر و زەنگ و دەسەڵاتی رەها بوو: " دەموچاوی باوكم پڕ لە زەبروزەنگێكی سەیری پیاوانە بوو. ئەو مۆن و ساردو توند بوو. سەربازێكی راستەقینە بە دەموچاوێكی خواستراوەوە یان باشتۆر بڵێم بە دەمامكی خۆدەربازكردنەوە: هەمیشە هەروا بوو. بیرمە هەر كە دەنگی پۆستاڵەكانی بەرز دەبۆوە هەمووومان شپرزە دەبووین و خۆمان لەبەرچاوو و بەردەستی دوور دەخستەوە. بەڵام هەرئەم باوكە كاتێ جارجار دەهاتەوە سەرخۆی و دەمامكەكەی فرێ دەدا، بەگەرمترین هەست و سۆزەوە لەباوەشی دەگرتین و جوانترین فرمێسك لەگۆشەی چاوەكانیەوە دەرژانە خوارێ. باوكم عاشقی شیعر بوو و ئێستاش هەر وایە. باوكم بێجگە لە خوێنەدنەوە هیچ سەرگەرمی یەكی تری نەبووە و نیە. باوكم

---

[1] لەپێشەكیی دیوان اشعار فروغ ـەوە وەرگیراوە، بە مەبەستی كورت كردنەوە، هەندێ پەرەگرافی تەرجەمە نەكراوە

[2] سوهرابی سپیهری، هۆنراوی " هاورێ" كە شیننامەیە بۆ فروغ

هەمیشە لە دووی لێکۆڵینەوەو دۆزینەوە بووە و هەر واشە. هەمووماڵەکەی پڕ کردبوو لە کتێب و ئێستاش ژمارەیەك لەو کتێبانە لە ژووره تۆزداگرتووەکەیدا بەم لاو لادا کەوتوون."[٣]

دایکی فروغ ئافرەتێکی سادە بوو، دەتووت لەسەردەمی رابوردوودا دەژی، رابوردووی پڕ لە چاکە وجوانی و نەریتی پیرۆز. " دایکم ژنێك بوو بە مانای تەواوی وشە. ژنێکی سادە دڵ، منداڵ ئاسا و خۆش باوەڕ. ژنێك کە توانای ناسینی خراپەی نەبوو و هەموو دنیا و مرۆڤەکانی لەشێوەی باش و چاکەدا دەبینی، ژنێك بوو بەستراوە بە هەموو عادەت و نەریتەکانەوە."[٤]

براکانی فروغ بریتی بوون لە ئەمیر مەسعوود و میهرداد و میهران و فەرەیدوون و خوشکەکانیشی پووران و گلۆریا بوون. فروغ چوارەمین منداڵی ئەم خێزانە بوو.

منداڵی فروغ لە دنیای چیرۆکدای تێپەڕی." لە منداڵیدا شەیدای چیرۆك بوو. باوەگەورەمان زۆر چیرۆکی خۆشی دەزانی و فروغ یەك سات وازی لێ نەدەهێنا. کاتی گوێی بۆ چیرۆکەکان رادەگرت تووشی دڵگەرمی یەکی سەیر دەبوو."[٥]

تیشك و بووك و شنەی نەسیم و باڵندە، رۆشنایی و ئاو سەراپای ژیانی منداڵیی فروغیان سەرریژ کردبوو، بەجۆرێك کە دواتریش لەدووتوێی جل و دەفتەرەکانی سەردەمی منداڵیدا بەدوای زەمانی ونبووی منداڵیی خۆیدا دەگەڕا. " بەنیسیبەت منەوەئێستاش کە سەردەمی منداڵی و تەنانەت لاویشم ( لەرووی دەروونییەوە) تەواو کردووە ولە زۆربەی ئەو هەست وسۆزانەی کە خەڵکی لایان وابوو تەنیا بەهۆی منداڵی وناکامڵی یەوە سەرهەڵدەدەن، خاڵی بوومەتەوە، کەچی هێشتا زۆر شتی وا هەن گەرچی بەرواڵەت مایەی پێکەنینن، بەڵام بەتوندی من دەهەژێنن. هێشتا کاتێ سەرەتای پاییزی هەموو ساڵی کە دایکم جلوبەرگی

[٣] قسەی پورانی فەرروخزاد بۆ رۆژنامەی کەیهان، ١٣٥٠/١١/٢١

[٤] هەمان سەرچاوە

[٥] پورانی فەرروخزاد، هەفتەنامەی بامشاد، ئابانی ١٣٤٧

منداڵەكان لە سندووقەكان دەردەهێنێ تا بیان دا بەهەتاو، گەڕان بە ناو گیرفانەكانیاندا و دۆزینەوەی دەنكە نۆكێ یان كشمیشێكی گەنیو كە زۆر جار لە بنی گیرفانەكاندا ماون، من تووشی حاڵەتێكی سەیر دەكات. كتوپڕ خۆمم ئەوەندە بچووك و بێگەرد وبێخەیاڵ دێتە بەرچاو. دەنكە گەنم و شادانە كەنووساون بەدەزووی بنی گیرفانەكانەوە دەمگێڕنەوە بۆ ساڵانی زوو. ئەو هەستە ناسك و شادەی سەردەمی منداڵیم زیندوو دەكەنەوە. ئێستاش دەفتەرەكانی مەشقی پۆلی دوو و سێ‌ی سەرەتاییم ماون هەموو سامانی من ئەو كاغەزە كۆنانەن كە بە درێژایی ئەم ساڵانە كۆم كردۆتەوە و بۆ هەركوێ دەچم لەگەڵ خۆمی دەبەم. ئەو كاغەزانەی كە رۆژانێك دەست هاورێكانم لەسەریان نیشانەیەك ، نووسینێك یان وێنەیەكیان كێشاوە. بینینی هەریەكێ لەوانە دەمخاتەوە بیری یەكێ لە رۆژە لەدەست چووەكانی ژیانم و دەڵـێ‌ی دیسان هەموو شتێكم بۆ تازە دەبێتەوە."[٦]

سەرهەنگ محەمەدی فـەرروخزادی بـاوكی فـروغ بـەحوكمی كارەكـای خـۆی شـێوازێكی تایبـەتیی لەپـەروەردەكردنی منداڵەكانیـدا بـەكار دەهێنـا. زۆر حـەزی دەكرد منداڵەكانی وەكوو سەربازی سوپا لەگەڵ سەختی و دژواریدا رابـێن. " بـاوكم هەر لەمنداڵییەوە ئێمەی لەگەڵ زەحمەت و دژواریدا راهێناوە. گەرچی لەماڵەكەماندا بەتانیی نەرم و زۆرچاك هەبوو، بـەڵام ئێمـە لـەژێر بـەتانیی سـەربازیدا نوسـتووین و گەورەبووین. باوكم بەو شێوازە تایبەتییەی بۆپەروەردەكردنی مندالەكانی گرتبوویە بەر ئێمەی گەورەكردووە.بیرمە كاتێ لەسەرەتایی بووین بەدرێـژایی پـشووی هـاوین لەگەڵ براكانمدا لەماڵەوە دادەنیـشتین و كتێبەكۆنـە و رۆژنامـە دراومـان دەكـرد بـە زەرف و خزمەتكارەكەمان دەیبرد لەبازار دەیفرۆشتن و پارەكـەی بۆدەهێنایـنـەوە و ئـەو پارەیـەی لەمـەوە دەسـتمان دەكـەوت جگـە لـە پـارەی رۆژانـەی خۆشمـان ، بـەئارەزووی خۆمـان سـەرفمان دەكـرد. بـاوكم بـەمجۆرە دەیویـست پێمـان بڵـێ كاركردن نەنگ نیە و هەركەسێ بتوانێ بـە بـازووی خـۆی نـان پەیدا بكـا هەقیـەتی

[٦] فروغی فەرروخزاد، بیرەوەرییەكانی سەفەری ئەورووپا، گۆڤاری فیردەوسی، ساڵی نۆیەم

پیاوی خۆی بێ و سەربەرز بێ. ئەڵبەتە ئێمە هیچ پێویستمان بە کارکردن نەبوو، ئەوەندەی بیرم بێ هەمیشە بەشێوەیەکی شایستەکەلوپەلی ژیان و خوێندنی بۆ دابین دەکردین. ئەگەر بەلای خەڵکەوە من کەللەرەق وپشت بەخۆبەستووم ئەوە لەو رووەوە قەرزاری شێوازی پەروەردەی باوکم."[٧]

فروغ سەردەمی بێخەیاڵیی تێپەراند و چووە قوتابخانە. لەم سەردەمەدا فروغ زۆر حاڵەتی جیاوازی هەبوو. " شەیتانێك بوو بەسەر دارو بەردا سەردەکەوت. وەك کورگەل دەچووە سەر پۆپەی درەختەکان و وەك شەیتان بە رەفتاری خەڵکی دەهێنایە پێکەنین."[٨] لە روویەکی تریشەوە کیژۆڵەیەکی " غەم داگرتووی بیانووگری ورکن و هەستیار بوو کە جاری واهەبوو لەبەر هۆی زۆر هیچ ماوەیەکی زۆر بەدەنگی بەرز دەگریا."[٩] سەرەنجام فروغ سەرەتایی تەواو کرد و چووە سانەوی.

لەبەرئەوەی باوکی عاشقی شیعرو ئەدەبیات بوو فروغیش کە کەم کەم ئارەزووی خوێندنەوەی شیعری لا پەیدا بووبوو و لەم سەردەمەدا خوێندنەوەی شیعری زیاتر و گەرمتر درێژە پێدا و وردە وردە شیعر وتن هاتە سۆراغی. " هەرگیز ئەو رۆژەم لەبیر ناچێ کە فروغ بۆ یەکەم جار شیعرێکی کورتی نووسی ونیشانی منی دا. من ئێستاش ئەو شیعرەم بە دەستوخەتی فروغ لاماوە. لەسەر شێوازی نوێ بوو، بە برگەی ( دوور لێرە، دوور لێرە) دەستی پێدەکرد. ئەو کاتە فروغ لە سانەوی بوو."[١٠]

فروغ خۆی لەم بارەیەوە دەڵێ:" کە ١٣-١٤ ساڵە بووم زۆر شیعری غەزەلم دەنووسی بەڵام قەت بڵاوم نەدەکردنەوە. ئیتر شیعربوو دەموت، بەشێوەیەکی غەریزەیی لە ناخمدا دەجۆشا. رۆژی دوو سێ دانە، لە مووبەق، لە

---

[٧] هەمان سەرچاوە

[٨] قسەی پورانی فەرروخزاد بۆ رۆژنامەی کەیهان، ١٣٥٠/١١/٢١

[٩] هەمان سەرچاوە

[١٠] قسەی باوکی فروغ بۆ رۆژنامەی کەیهان، ١٣٥٣/١١/٢٤

سـەر مەكینـەی جـل دروون. هـەروا دەمگـوت. زۆر یـاخی بـووم، هـەر لەخۆمـەوە دەموت. چونكە یەك لەسەر یەك دیوانم دەخوێندەوە و پڕ دەبووم. تۆزێ بەهرەشـم هەبوو. ناچار دەبوو بەجۆرێك هـەڵی رژم. نـازانم ئەوانـە شـیعر بـوون یـان نـا بـەڵام دەزانم زۆر (من) ی ئەو سەردەمە بوون، بێگەرد بوون و ئەزانم زۆر ئاسانیش بـوون. مــن هێــشتا نەخــەملێیبووم، زمــان و شــێواز و دنیــای فیكــری خــۆمم بەدەســت نەهێنابوو."[١١]

شان بەشانی شیعر فـروغ لـە دارشـتنی پەخشانیـشدا پێـشكەوتنێكی باشـی بەدەست هێنابوو، بەجۆرێك مامۆستای دارشتن باوەری نەدەكرد ئەو پەخـشانانەی فروغ لە پۆلدا دەیانخوێنێتەوە هـی خـۆی بـن. " یـەكێ لـە هاورێكـانی پـۆلی فـروغ دەیوت: وانەی دارشتن بە نیسبەت فروغەوە ناخۆشترین وانە بوو. هەمیـشە دەیـوت لە دارشتن بێزارم، چونكە پەخشانی زۆر جـوانی دەنووسـی و مامۆسـتاش هەمیـشە سەرزەنشتی دەكرد و پێی دەوت: فروغ تۆ ئەمانە لە كتێب دەدزی."[١٢]

لە كاتێدا لە سانەوی دەیخوێند و تەمەنی لە ١٦ساڵ تێنەپـەری بـوو، فـروغ لە پرێكدا شووی كرد( ١٣٢٩). " فروغ لە پـۆلی حـەوت بـوو كاتـێ شـووی كـرد بـە پەرویزی شاپور. پەرویز نەوەی پـووری دایكمـە. ئەوكاتـە زۆر دەهاتـە مـاڵی ئێمـە. كابرایەكی خۆش مـەجلیس و قۆشمـە بـوو. منداڵـەكانی لـە خـۆی كـۆ دەكـردەوە و چیرۆكی هەزەلی بۆ دەگێرانەوە و فروغ زەق زەق چاوی دەبریە دەمـی پـەرویز. كـە ئێمە هەستمان بەوە كرد كە ئەم جووتە عاشقی یەك بـوون هـەموو سەرسـام بـووین چونكە فروغ لە پۆلی حەوت بوو و پـەرویز زانكـۆی تـەواو كردبـوو، پـازدە سـاڵ لـە فروغ گەورەتر بوو. كاتێ ویتەویتی شوو كردن بڵاوبۆوە خێزانەكـەمان رازی نـەبوون بـەڵام زۆری نـەبرد بـاوكم رەزایـەتی دا. كـاتی گواسـتنەوە بیرمـە شـاپور تەنانـەت نەیتوانی جلی بووكێنیش بكرێ چونكە هیچی نەبوو ئەمـەش مایـەی نـارەزایی ئێمـە

[١١] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٢٧–٢٨

[١٢] گۆڤاری زن روز، ئەسفەندی ١٣٤٥

بوو. بەڵام فروغ مانی لە خورادن گرت و تۆرا و وتی من ئاهـەنگم نـاوێ، جلـم نـاوێ، خشڵم ناوێ، هیچم ناوێ.بەم جۆرە شووکردنێکی سـادە و بـێ مەراسـیمیان ئـەنجام دا."[١٣]

پاش تەواو کردنی پۆلی سێیەمی سانەوی( ناوەندی) فروغ چـووە ئامـادەیی پیشەیی ئافرەتان و فێری بەرگدروون و وێنەکێشان بوو. ماوەیەکیش لای مامۆسـتا عەلی ئەسغەری پەتگەر وێنەکێشانی دەخوێند.

ساڵی ١٣٣١ کاتێ تەمەنی فروغ لە ١٧ ساڵ تێنەپەری بوو، یەکەمین کۆمەڵە هـۆنراوەی بـەناوی ( ئەسـیر) ــەوە بڵاوکـردەوە. ئـەم کتێبـە سـاڵی ١٣٣٤ یـش بـە هەندێ گۆڕانگارییەوە دووبارە چاپ کرایەوە.

هەر لەم سەردەمەدا هۆنراوەیەکی فـروغ ( گوناهــ) لەیـەکێ لـە گۆڤارەکانـدا بڵاوکرایـەوە. " کاتـێ هـۆنراوەی ( گونـاهم کـرد) لـە گۆڤارێکـدا بڵاوکرایـەوە جـاڕو جەنجاڵێکی زۆر لەناو خێزانەکەیدا بەرپا بوو. فروغ جانتاکەی هەڵگرت و ماڵی باوکی بەجێ هێشت. ژوورێکی لە پشت سانەوی فیروزکوهی یەوە بـەگرێ گـرت تـا تیایـدا بژی. ئەو کاتە تەنانەتە یەك سەرینیشی نەبوو. ئەتوانی بـە ئاسـانی وەزعـی بێنیتـە بەر چاوی خۆت" پارەی نـەبوو، ئیـشی نـەبوو، مووچـەی نـەبوو، لـەژێر گوشـارێکی زۆردا بوو. فروغ بە دژوارترین بارودۆخ دەستی پێ کرد."[١٤]

باوکی فروغ لەم بارەیەوە دەڵێ:" ژیانی فروغ دوو قۆناغ بوو: کاتێ دەسـتی بە شیعر وتن کرد من هانم دەدا، بەڵام کاتێ شیعر وتـن بـووە هـۆی دروسـت بـوونی جاڕو جەنجاڵ لەدەوری، خەریك بوو ژیانی خێزانیی لێك بترازێ، پـێم خـۆش نـەبوو، چـونکە لام وابـوو ئـەم هـەنگاوە و ئـەم ڕێگەیـەی هـەڵی بـژاردووە دەبێتـە هـۆی هەڵوەشانی ژیانی خێزانیی."[١٥]

[١٣] پورانی فەرروخزاد، هەفتەنامەی بامشاد، شەهریوەری ١٣٤٧
[١٤] قسەی پورانی فەرروخزاد بۆ ڕۆژنامەی کەیهان، ١٣٥٣/١١/٢٤
[١٥] قسەی باوکی فروغ بۆ ڕۆژنامەی کەیهان، ١٣٥٣/١١/٢٤

ئەم دابڕانەی فروغ لە خێزانەکەی زۆری نەخایاند. " تکام لە فروغ کرد ڕێگەم بدا لەگەڵ باوکی قسە بکەم و ئاشتیان بکەمەوە بۆ ئەوەی فروغ بتوانێ بگەڕێتەوەماڵەوە. بەڵام ئەو زەمانە فروغ زۆر باوەڕی بە باوکی نەبوو. باوك و دایکی لێك جودا ببوونەوەو باوکی ژنێکی تری هێنابوو. "[١٦] بەڵام سەرەنجام ناوبژی سەری گرت. " بە باوکی فروغم گوت: تۆ لەماڵەوە یەك ژوور بدە بە فروغ ئەو خۆی ڕێکی دەخات. باوکی ڕازی بوو و ژوورێکی چۆڵی پێدا. فرووغ ڕاخەری بۆ ژوورەکە کڕی و هاورێکانیشی هەیەکە شتێکیان بۆ برد و بەموجۆرە ژووەکەی تەرتیب بوو. بیرمە چەند جارێکیش هەر لەو ژوورەدا پێشوازی لە میوان کرد."[١٧]

ساڵی ١٣٣٢ فروغ لەگەڵ مێردەکەیدا کۆچی کرد بۆ ئەهواز تا ژیانێکی تازە دەست پێ بکات. بەڵام زۆری نەخایاند فروغ گەڕایەوە بۆ تاران چونکە لەگەڵ مێردەکەیدا نەیانتوانی بوو پێکەوە بژین و بەسەر جیاوازییەکانیاندا زاڵ ببن. لەدایکبوونی (کامیار)ی کوڕیشیان نەك هەر ئەم جیاوزازییانەی کەم نەکردەوە بگرە فراوانتریشی کرد. " فروغ تا لەدایکبوونی کامیاری کوریشی هێشتا هەر نەبوو بوو بە ژنێکی تەواو، منداڵ بوو. ئەو تاتەمەنی ١٤–١٥ ساڵی زۆر ناشیرین بوو. ئەم ناشیرینییەی سیماشی زۆر ئازای دەدا. بەڵام کە کامی هاتە دنیاوە فروغ شکۆفەی کرد. لەپرێکدا جوان بوو. پاش ئەوەش ناکەکی نێوان خۆی و شاپور زیاتر و بەتینتر بوو. ئەم ناکۆکییە هەرچی بووبێ لە پەیوەندی عاتیفی نێوانیانەوە سەری هەڵ نەدەدا. فروغی خوشکم ژنێکی میزاج سارد بوو. ئەگەر زۆر پەنای دەبردە بەر موحیبەتی زۆر کەس لەبەر مەسەلەی عاتیفەیی و غەریزەیی نەبوو، بەڵکو بەهۆی ئەو نەبوونی موحیببەتەوە بوو کە هەموو دڵی ساردکربۆوە. سەرەنجام ناکۆکییەکە پەرەی سەندو فروغ نەخۆش کەوت و ماوەیەك لە ئاسایشگا(ی دەروونی) کەوت. کە دەرچوو، ماوەیەکی زۆر دوای ئەوەی ئاسایشگاشی بەجێ هێشتبوو، هەر حاڵی

---

[١٦] تووسی حایری، هەفتەنامەی بامشاد، ١٣٤٧/٦/١٢

[١٧] هەمان سەرچاوە

خراپ بوو. فروغ و شاپور لە دوو دنیای جیاواز بوون. فروغ هەست ناسك و پەرێشان و سەرشێت بوو بەڵام پەرویزی شاپور کابرایەکی مەنتیقی و بە حساب و بەکورتی پیاوێکی ئاسایی بوو کە وەك هەموو پیاوانی تر دیدێکی تایبەتی بۆ ژیان نەبوو. هەڵبەتە ئەو دووە نەیانتوانی پێکەوە بژین."[١٨]

سەرەنجام ساڵی ١٣٣٤ لەیەك جواد بوونەوە. فروغ خۆی دەستی لەم جیابوونەوەیەدا هەبوو: " من حەزم نەدەکرد فروغ لە مێردەکەی جودا ببێتەوە بەڵام ئەو ئەوەندە سوور بوو لەسەر ئەوە تا سەرەنجام جیابووەوە. ئەخلاق و رەفتاری فروغ تایبەت بە خۆی بوو. لەهەمان کاتا کە ئەوپەری میهرەبان و هەست ناسك و بەبەزەیی بوو، بیرورای تایبەت بە خۆیی هەبوو. هیچ شتێك و هیچ کەسێك نەیدەتوانی لەو بیرورایەی یان لەو بڕیارەی کە داویەتی دەست هەڵگرێ. هەرچەندە وەکوو باوك کاریگەریم لەسەری هەبوو بەڵام کاتێ بڕیاری دەدا بەهیچ جۆرێك نەمدەتوانی کاری تێبکەم. گەرچیش بەرواڵەت ئەمەم پێ ناخۆش بوو بەڵام لەناخەوە ئافەرینم دەکرد."[١٩]

لەم جیابوونەوەیەدا راستی یەکی تریش شاراوەیە کە نابێ لەبیربکرێ، ئەویش ئەوەیە فروغ ناچاربوو لە نیوان شیعرو ژیاندا یەکێکیان هەڵبژێرێ. بەوکەللەرەقییە غەریزەیی یەی فروغیشەوە کە دەڵێ :" من لەو مرۆڤانە نیم کە ئەگەر ببینم یەکێکی تر سەری داویەتی بەبەردا و شکاوە ئیتر بێمە سەر ئەوباوەرەی نابێ بەرەو رووی بەرد بچم. من تاسەری خۆم نەشکێ مانای بەرد تێناگەم،"[٢٠] ئەو رێگەی شیعری گرتەبەرو پەیوەندی لەرزۆکی نێوان ئەو دوو مرۆڤەی هەڵوەشاند.

---

[١٨] پورانی فەرروخزاد، هەفتەنامەی بامشاد، ٢٦ی شەهریوەری ١٣٤٧

[١٩] تووسی حایری، هەفتەنامەی بامشاد، ١٣٤٧/٦/١٢

[٢٠] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٢٧–٢٨

یاساش، ئەم پەتە لەرزۆكەی عەدالەت، كوڕەكەی لە فروغ سەند و تەنانەت ڕێگەی بینینیشی پێ نەدا. فروغ شازدە ساڵی تەواو تاكۆتایی ژیانی شەیدای كورەكەی بوو بێ ئەوەی بیبینێ و سوێندی سەرەكیشی " بەگیانی كوڕەكەم " بوو. كاتێ چاوی مندالآنەی عیشقی ئەویان بەدەسرِی یاسا بەست، فروغی یاخی هیچی بۆ نەمایەوە شەیدا بوون و خۆش ویستن نەبێ، خۆش ویستنێكی شێتانە.

كاتێ كە ئیعتیمادی من هەڵواسرابوو بە پەتی ناسكی عەدالەتاو
لەگشت شارا
دڵی چراكانمیان پارچە پارچە دەكرد
كاتێ كە چاوی مندالآنەی عیشقی منیان
بەدەسرِی تاریكی یاسا دەبەست و
لە لاجانگی پەشێوی ئارەزوومەوە
فوارەی خوێن هەڵ دەقوڵا
كاتێ كە چیتر ژیانم
شتێ نەبوو، شتێ نەبوو غەیری تیكتاكی كاتژمێری دیواری
لە بۆم دەركەوت كە دەبێ، دەبێ ، كەدەبێ
وەكوو دێوانە عاشق بم[٢١]

بەمجۆرە بەهۆی شەیدایی شیعرەوە فروغ لە ژیانی خۆی و لە كورەكەی بێبەری ببوو و هۆنراوە ببووە جووت و هاورێیەكی تر. " پەیوەندی نێوان دوو مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ تەواو یان تەواوكەر بێ، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا. بەلآم شیعر بۆ من وەك هاورێیەكە هەر كاتێ پێی دەگەم ئەتوانم بەدڵی خۆم دەردەدڵی بۆ بكەم. شیعر جووتێكە من تەواو دەكات... هەندێ كەس كەموكوری خۆیان بە پەنابردنە

[٢١] باوەربێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما، هۆنراوەی پەنجەرە

بەر خەڵکی تر چارە دەکەن، بەڵام هەرگیز چارە ناکرێ. ئەگەر چارە بکرابا ئاخۆ هەر ئەم پەیوەندییانە خۆیان گەورەترین شیعری دنیای وجوود دەرنەدەچوون؟"[٢٢]

بەنیسبەت فروغەوە شیعر دەرگایەك بوو دەیبەست بە وجوودەوە، شتێك بوو بۆ تەبریر کردنی خودو دۆزینەوەی خود. " شیعر لای من پەنجەرەیەکە هەرکاتێ بۆلای دەچم بەروومدا دەکرێتەوە، دادەنیشم، دەروانم، گۆرانی دەلێم، هاوار دەکەم، دەگەرێم، لەگەڵ وێنەی درەختەکاندا تێکەڵ دەبم و ئەزانم کە لەولای پەنجەرەکەوە دنیایەك هەیە و یەکێك دەبیستێ" کەسێك لەوانەیە ٢٠٠ ساڵ لەمەودوا هەبێ یان ٣٠٠ ساڵ لەمەوبەر هەبووبێ. جیاوازیی نیە. شیعر هۆکارێکە بۆ پەیوەندی کردن بە وجوودەوە بە مانا گەورەکەی. خۆشییەکەی ئەوەیە کاتێ مرۆڤ شیعر دەڵێ دەتوانێ بڵێ: منیش هەم، یان منیش هەبووم. من لە شیعری خۆمدا بەدوای هیچا ناگەرێم بەڵکوو لە شیعری خۆمدا تازە خۆم دەدۆزمەوە."[٢٣]

وردە وردە شیعر لای فروغ بوو بە شتێکی جیددی. شیعر وەڵامێکە دەبی بە ژیانی بداتەوە. " ئێستا شیعر بەلای منەوە مەسەلەیەکی جیددییە.بەرپرسیارییەکە لەبەردەم وجوودی خۆمدا هەستی پێدەکەم. وەلامێکە ئەبێ بە ژیانی خۆمی بدەم. من ئەوەندەی کابرایەکی دیندار بە ئایینەکەی، رێزم بۆ شیعر هەیە. "[٢٤] بەراستیش دەبێ وابێ چونکە " شیعر لەراستیدا بەشێکە لە ژیان و هەرگیز ناکرێ جیا لە ژیان و لەدەرەوەی بازنەی ئەو کاریگەییانە دا بێ کە ژیانی واقیعی بە مرۆڤی دەگەیەنێ. ژیانی رووحی و تەنانەت ژیانی مادیش دەکرێ بە چاوێکی شاعیرانە تەماشا بکرێ. لەراستیدا ئەگەر شیعر بێموبالات بێ بەو دەوروبەرو هەلومەرجەی کە تیایدا دێتە کایەوە و گەشە دەکا، هەرگیز ناتوانێ ببێ بە شیعر."[٢٥]

---

[٢٢] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٤٨

[٢٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[٢٤] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٧٠

[٢٥] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٧-٨

بەڵام ئەگەر شیعر لای فروغ بەشێك لە ژیان بووایە هەرگیز ئاوا خۆی نەدەکردە قوربانی و خاچی لەناوچوونی خۆیی بەمجۆرە نەدەدا بە شانیدا. شیعر لای ئەو هەموو ژیان بوو، هەموو ساتەکانی ژیان لای ئەو ساتی شاعیرانە بوون، " باوەڕم بە شتێکی تریش هەیە، ئەویش شاعیرێتی یە لە سەراپای ژیاندا. شاعیرێتی واتە مرۆڤێتی. هەندێ کەس ئەناسم رەفتاری رۆژانەیان هیچ پەیوەندەی بە شیعرەکانیانەوە نیە. یانی تەنیا ئەو کاتە شاعیرن کە شیعر دەڵێن. پاش ئەوە تەواو. دیسانەوە دەبنەوە بە مرۆڤێکی رژدی نەوسنی زاڵمی بیرتەنگی چارەرەشی بەخیلی هیچ و پووچ. بەڵێ من قسەی ئەم جۆرە مرۆڤانەم قبووڵ نیە. من زیاتر گرنگی بە ژیان دەدەم و کاتێ ئەم کەسانە خۆیان سنگ دەردەپەرێنن و هاوا دەکەن ، مەبەستم لە شیعرو وتارەکانیاندا، من قینم هەڵ دەستێو باوەریان پێ ناکەم. ئەلێم بڵێی ئەم هاوارهاوارەیان بۆ قاپێ پڵاو نەبێ ؟ لەوباوەرەدام ئەوکەسەی کاری هونەری دەکا پێویستە سەرەتا خۆی دروست بکا و کامڵ بکا بۆ ئەوەی بتوانێ حاڵەتێکی گشتگر ببەخشێ بە هەموو دەرك و بیر و هەستەکانی."[٢٦]

ساڵی ١٣٣٥ فروغ سەفەری ئیتالیای کرد. ئەم سەردانە بیانوویەك بوو بۆ دەربازبوون لەو بارودۆخەی تێیدا گرفتار بووبوو. "گوشاری ژیان، گوشاری دوروبەر و گوشاری ئەو زنجیرانەی بەدەست و پێمەوە بەسترابوون و منیش بەهەموو توانامەوە کۆششم دەکرد لەبەرامبەریاندا خۆم رابگرم، تەواو کەنەفت و پەرێشانیان کردبووم. من دەمویست یەك (ئافرەت) یانی یەك (مرۆڤ) بم. دەمویست بڵێم منیش مافی هەناسەدان و هاوارکردنم هەیە خەلکیش دەیانویست هاوارم لەسەرلێو و هەناسەم لە سینەدا کپ بکەن و بتاسێنن. ئەوانە چەکێکی تیژیان هەڵبژاردبوو منیش چیتر نەمدەتوانی پێبکەنم" نەك لەبەر ئەوەی پێکەنینم پێنەمابوو ، نەخێر

---

[٢٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧٠

بەلکوو هێزم تیا نەمابوو. بۆیە مەبەستی بەدەست هێنانی توانا و وزەی تازە بۆ دیسان پێکەنین، لە پرێکدا بریارم دا ماوەیەك لەم دەوروبەرە دوور بکەومەوە."[٢٧]

پاش گەرانەوە بۆ ئێران فروغ دەستی دایە هونەرو داهێنان. " فروغ زۆری دەخوێندەوە، هەموو شیعرەکانی سەعدی ی لەبەر بوو. غەزەلەکانی حافزی لەبەر بوو. یەك لەحزە وازی لە خوێندنەوە نەدەهێنا. بیرمە پێش ئەوەی فروغ کارو داهاتێکی هەبێ تەنیا ٥-٦ کتێبی هەبوو بەلاّم لەم دوایی یەدا کتێبخانەیەکی تەواو گەورەی هەبوو. زۆر کەیفی بە خوێندنەوە دەهات و بیریشی باش بوو. ورد بوو. هەر شیعرێکی بوتایە یەکسەر لەبەری دەکرد. شیعرەکانیشی یەکجارە دەوت، هیچ دەسکاری نەدەکردن، هەمووی پێکەوە دەوت و لەسەر کاغەزێك پاکنووسی دەکرد."[٢٨]

سالّی ١٣٣٦ کۆمەلّە هۆنراوەیەکی تری فروغ بلاّوبۆوە بە ناوی (دیوار). ئەم هۆنراوانە گەرچی لەرووی ناوەرۆکە لە هۆنراوەکانی (ئەسیر) دەچوون، بەلاّم نیشانەی بەرەوپێشچوونی فروغیان پێوە دیار بوو لەمەیدانی شیعر و ئەزموونی تازەدا. " لە (ئەسیر) دا من تەنیا یەك دەربڕی سادەی دنیای دەرەوە بووم. ئەوسەردەمە هێشتا شیعر نەچووبووە ناخی منەوە. بەلّکوو هاومالّم بوو وەکوو مێرد، وەکوو دلّدار، وەکوو هەموو ئەو مرۆڤانەی ماوەیەك لەگەلّت دەبن. بەلاّم پاشتر شیعر لە مندا رەگی داکوتا و هەربۆیەش بابەتی شیعرم گۆرا. چیتر شیعر لای من دەربرینی هەست و نەستی تایبەت بە خۆم نەبوو. تا زیاتر شیعر لە مندا دەچەسپا من زیاتر بلاّو دەبوومەوە و جیهانی تازەم دەدۆزیەوە."[٢٩] پاشتر ئەزموونەکانی فراوانتر بوون و شاملۆی ناسی و بە دیدی شاملۆ بۆ ( زمان) ئاشنا بوو . " کاتێ ( ئەو شیعرەی کە ژیانە- شیعری شاملۆ)م خوێندەوە بۆم دەرکەوت

[٢٧] گفتوگۆ لەگەلّ فروغ، ل ٥

[٢٨] گفتوگۆ لەگەلّ فروغ، ل ١٥

[٢٩] گفتوگۆی سەدرەدینی ئیلاهی لەگەلّ فروغ، گۆڤاری سپید و سیاه ، ئەسفەندی ١٣٤٥

توانای زمانی فارسی زۆر گەورەیە. بۆم دەرکەوت دەتوانی بە ساکاری قسە بکەی. تەنانەت سادەتریش لە (لەو شیعرەی کە ژیانە). واتە بەهەمان ئەو سادەیی یەی کە ئێستا لەگەڵ ئێوە قسە دەکەم. بەلاّم تەنیا دۆزینەوە بەس نیە. وا بۆشم دەرکەوت، پاشان چی؟ لاسایی کردنەوەش تەجرەبەی دەوێ. .."[30]

لە کۆتای ئەزموونێکی زۆردا سەرەنجام فروغ نیما و پانتایی دیدی نیمای ناسی. "من زۆر درەنگ نیمام ناسی و رەنگە بەواتایەکی تر زۆر لەکاتی خۆیدا ناسیبێتم. واتە پاش ئەو هەموو ئەزموون و دڵە راوکە و تێپەراندنی سەردەمی سەرگەردانی و لەهەمان کاتدا گەڕانەدا. زۆر زووتر شاعیرەکانی دوای نیمام ناسی وەك شاملۆ و ئیخوان. لە ١٤ ساڵیدا مەهدی حەمیدی و لە بیست ساڵیدا نادرپوور و سایە و موشیری باشترین شاعیری من بوون. هەر ئەو سەردەمە بوو گوڵچین و لاهووتی و گەیلانیم ناسی و ئەم دوزینەوەیە چاومی لەبەردەم ئەو جیاوازی و مەسەلە تازانەدا کردەوە کە پاشتر لە مێشکمدا شاملۆ رێکی خستن و زۆر پاشتریش نیما بۆچوون و سەلیقەی، ئەتوانم بڵێم هەمیشەییمی، دەربارەی شیعر (دروست کرد) و شێوەیەکی هەمیشەیی پێ دا. .. ناتوانم بڵێم لەچ بوارێکدا لە ژێر کاریگەری نیمادام یان نیم. وردبوونەوە لەمە کاری خەڵکی ترە. بەلاّم ئەتوانم بلێم لەرووی فۆرمی شیعر و زمانەوە کەڵك لە شێوازەکانی ئەو وەردەگرم. بەلاّم لەولاشەوە- واتە هەبوونی بۆچوونی فیکریی تایبەتیی خۆم و ئەوەی کە لەراستیدا گیانی شیعرە- ئەتوانم بڵێم لەوەوە فێر بووم چۆن بروانم ، واتە ئەو پانتایی نیگای بۆ نەخشە کێشام. من ئەمەوێ بگەمە ئەو رادەیە. رەگ یەکە بەلاّم ئەوەی چەکەرە دەکا جیاوازە چونکە مرۆڤەکان جیاوازن. من بەهۆی تایبەتمەندێتی رۆحی و ئەخلاقیی خۆمەوە- بۆ نموونەش ئافرەت بوونم- بێگومان مەسەلەکان بە جۆرێکی

---

[30] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٢٩

تر دەبینم. من ئەمەویٚ نیگای ئەوم هەبیٚ بەڵام لەپەنجەرەی خۆمدا دابنیشم. نیما چاوی منی کردەوە و وتی: ببینە. ئیتر من خۆم فێری بینین بووم."[٣١]

کتێبی ( یاخی بوون) کە ساڵی ١٣٣٨ بڵاوبۆوە دوا ئەزموونی شاعیرێك نیشان دەدات کە لە کۆششی ئەوەدایە شێوازی تایبەت بە خۆی بدۆزێتەوە. " لەراستیدا (دیوار) و ( یاخی بوون) چەنگە ڕنێیەکی نائومێدانەن لە نێوان دوو قۆناغی ژیاندا. دووا هەناسەکانی پێش جۆرێك قوتار بوونن. پیاو دەگاتە قۆناغی تێڕامان. لە لاویدا رەگوریشەی ئیحساسات لاوازن بەڵام سەرنج راکێشترن. پاشتر ئەگەر ئەمانە لەلایەن بیرەوە رێبەرایەتی بکرێن یان ئەنجامی بیرکردنەوە نەبن، وشك دەبن و تەواو دەبن. من روانیمە دنیای دەورم، شتەکان و مرۆڤەکانی دەورم و هێڵە سەرەکییەکانی جیهانی دەوروبەرم. کەشفم کرد و کاتیٚ ویستم دەریبڕم بینیم پێویستم بە وشەیە. وشەی تازە کە هی ئەم دنیایەن. ئەگەر بترسامایە دەمردم بەڵام نەترسام. وشەکانم هێنا. با ئەم وشانە هێشتا شاعیرانەش نەبن خۆ گیانیان تێدایە، دەیان کەین بە شاعیرانە."[٣٢]

فروغ هەوڵی دابوو کوڕی سەردەمی خۆی بیٚ و لە ئاوازی زەمانی خۆی تیٚ بگا، نە نوقمی ئەدەبی کلاسیکی بیٚ و نە تواوەی ئەدەبیاتی ئەوروپایی. " یەکیٚ لە خۆشبەختییەکانی من ئەوەیە کە نەزۆر خۆمم لە ئەدەبیاتی کلاسیکیی خۆماندا نوقم کردووە و نە زۆر کەوتوومەتە ژێر کاریگەریی ئەدەبی فەرەنگییەوە. من لە ناخی خۆم و لە دنیای دەوری خۆمدا بەدووی شتێکدا دەگەڕێم.. لەسەردەمێکی دیاریکراودا کە لەرووی ژیانی کۆمەڵایەتی و فیکری و جۆری گوزەرانەوە تایبەتمەندێتیی خۆیی هەیە، نهێنیی کار لەوەدایە دەرك بەم تایبەتمەندێتییانە بکەین و هەوڵ بدەین ئەم تایبەتمەندێتی یانە ئاوێتەی شیعر بکەین. "[٣٣]

---

[٣١] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٢٥

[٣٢] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٢٨

[٣٣] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٣٢

شان بە شانی هونەر و داهێنان، شەیدایی کورەکەی خەیاڵی بەرنەدەدا. فروغ هونەری بەکورەکەیەوە دەویست و کورەکەشی بە هونەرەوە. " لە پێش هەموو شتێکەوە و لە هەموو شتێك زیاتر دڵبەستەی هونەرەکەمم و پاشان هی کورەکەم. ئارەزووم ئەوەیە کە کورەکەم گەورە بوو ببێ بە شاعیر یان نووسەر."[٣٤] بۆ سەرکوت کردنی ئەم خەیاڵانە فروغ هەوڵی ئەدا پەنا بەرێتە بەر شەیدایی تا خۆی لە خەیاڵاتی بەژانی جودایی لە کورەکەی قوتار بکا. "بەتەواوی ژیانی رابوردووم بەلاوە ناوە. کاتێ لەسەر جادە کامی دەبینم کە ئێستا ئەبێ بالآی تاسەر شانی من هەڵکشابێ، گیانم دەلەرزێ و دڵم خەریکە بتەقێ. بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا نامەوێ، نامەوێ. کەڵکی ئەم پەیوەندی و خۆبەستنەوانە چییە؟ مرۆڤ پێویستە بەدوای جووتی خۆیدا بگەرێ. هەرکەسە جووتێکی هەیە، ئەبێ جووتی خۆی بدۆزێتەوە. چونکە ژیان تەنیا هەوڵدانە بۆ پڕکردنەوەی نوقسانییەکان."[٣٥]

ساڵی ١٣٣٧ فروغ خووی دایە سینەما و لە کۆمپانیای ( گوڵستان فیلم) دەستی بەکار کرد. "بەلای منەوە سینەما رێگەیەکی دەربڕینە. ئەوەی کە من ماوەیەکی زۆرە شیعر دەڵێم مانای ئەوە نیە شیعر تەنیا رێگەی دەربڕینە. من حەزم لە سینەمایە. ئەگەر بتوانم لەهەر بوارێکی تریشدا کاردەکەم. ئەگەر شیعر نەبێ لە شانۆدا دەوردەبینم. ئەگەر شانۆ نەبوو فلیم بەرهەم دێنم. بەردەوام بوونی ئەمەش لەسەر ئەوە وەستاوە کە قسەکانی من بەردەوام بن، ئەڵبەتە ئەگەر قسەم هەبێ."

یەکەمین کاری فروغ مۆنتاجی فلیمی (ئاگرێك) بوو. مانگی دووی ساڵی ١٣٣٧ بیری نەوتی ژمارە شەشی ئەهواز لەکاتی هەڵکەندنا گەیشت بە چینێك گاز و ئاگری تێ بەربوو. ئەم ئاگرە بەتینە ٧٠ رۆژی خایاند تا خامۆش کرا. شاروخی گوڵستان نزیکەی ١٥٠٠ مەتر فلیمی لەم ئاگرەدا سەرف کرد. فروغ بە مۆنتاج کردنی ئەم ئەڵقە فلیمانە فلیمی ( ئاگرێك)ی ئامادە کرد بۆ بەرجەستە کردنی گیانبەخشی

---

[٣٤] نامەی فروغ، گۆڤاری خوشە، نەورۆزی ١٣٤٦

[٣٥] نامەی فروغ، گۆڤاری فیردەوسی، ٢٧ ی مورادادی ١٣٤٨

و بەجەرگیی کارمەندانی ماندوویێتی نەناسی کوژاندنەوەی ئاگرەکە. ئەم فلیمە ساڵی ١٣٤١ لە دوازدەهەمین فێستیڤاڵی کورتە فلیمی ڤینیسیا دا مەدالیای زێر و نیشانەی برۆنزی وەرگرت.

ساڵی ١٣٣٨ بەمەبەستی ئاشنا بوون و لێکۆلینەوە دەربارەی بەرهەم هێنانی فلیم سەفەری بەریتانیای کرد. ساڵی ١٣٣٩ دەزگای میللی کەنەدا داوای لە گوڵستان فیلم کرد فلیمێکی دەربارەی ئاهەنگی مارەبرین بۆ ئامادە بکات. فروغ لەم فلیمەدا دەوری بینی و لە ئامادەکردنیشیدا رۆڵیکی باشی هەبوو. لەو فلیمانەی تری کە فروغ دەوری کاریگەری لەبەرهەم هێنانیاندا گێراوە ( ئاو و گەرما) و ( شەپۆل و مەرجان و خارا) ن.

فروغ جارێکی تر سەردانی بەریتانای کردو پاش گەرانەوەی فلیمی یەك دەقیقەیی ( رۆژنامەی کەیهان)ی بەرهەم هینا، کە گەرچی فلیمێکی ریکلامی بوو بەلام شایانی سەرنج بوو. بە مەبەستی بەرهەم هێنانی فلیمێك دەربارەی نەخۆشە گەرەکان، ساڵی ١٣٤١ فروغ سەردانی تەبرێزی کرد. لە گەشتێکی تریدا هاورێ لەگەڵ تیمێکی ٣ کەسیدا ، لەماوەی ١٢ رۆژدا فلیمەکەی بەرهەم هێنا بە ناوی ( ماڵەکە رەشە) ئەم فلیمە لەسەر داوای (ئەنجوومەنی کۆمەك بە گەرەکان) بەرهەم هێنرا و دەربارەی نەخۆشە گولەکانی (ئاسایشگای گەرانی باباباغی)ی تەبرێز بوو. لە گفتوگۆیەکدا دەربارەی ئەم فلیمە، فروغ وتوویەتی" یەکەم رۆژ کە نەخۆشە گولەکانم بینی زۆر تێك چووم. ترسناك بوو. لەم گەرخانەیەدا کۆمەڵێك دەژین کە هەموو تایبەتمەندییەکان و هەست و نەستی مرۆڤیان هەیە بەلام لە سیمای مرۆڤ بێبەشن. ژنێکم بینی دەموچاوی تەنیا یەك کونی تێدا بوو ، لەو کونەوە قسەی دەکرد. بەراستی ترسناکە. بەلام من ناچار بووم دلّیان بەدەست بێنم. ئەمانە باش رەفتاریان لەگەڵ نەکرابوو. هەرکەس چووبووە لایان تەنیا عەیبەکانیانی بینی بوو. بەلام بەوخوایە من لەسەر سفرە لەگەڵیان دادەنیشتم، دەستم دەدا لە زامەکانیان، دەستم ئەهێنا بە قاچیانا کە گەری پەنجەکانی خواردبوو. بەم شێوەیە بوو گولەکان باوەریان پێم پەیدا کرد. کە ماڵئاواییم لێکردن دووعایان بۆ کردم. ئێستاش کە

یەك ساڵ بەسەر ئەو كاتەدا تێپەریوە هەندێكیان نامەم بۆ دەنێرن. داوام لێ ئەكەن عەریزەكانیان بگەیەنمە وەزیری تەندروستی و پێی بڵێم برنجەكەیان دەدزن، خواردنیان نیە، حەمامیان نیە. لەوێ پیاوێكی گولم بینی كە نزیكەی هەموو گیانی ئیفلیج بوو، لێویشی ئیفلیج بوو، بەدەست لێوی بەرز دەكردەوە قسە بكا، چاویشی كوێر بوو. كەچی هەر كە منی دەبینی دەیوت: ئاخر ئەوە چەند جارە عەریزە دەنووسم ژنەكەم بنێرن بۆ لام، من گولم بەڵام ژنەكەم ساغە و ئەیەوێ لەگەڵ مندا بژی. ژنە گولەكان زۆر سەیرن. یەك زەررە جوانییان تێدا نەماوە كەچی هەموو رۆژێ چاویان دەرێژن، پەنجە گولی خواردووەكانیان پڕ لە موستیلەن. تەنانەت ملوانكە و بازنەكانیشیان لە من سەند. ژوورەكانیان پڕە لە ئاوێنە. ئینسانن، چی بكەن ئیتر."[٣٦]

ساڵی ١٣٤٢ فلیمی ( ماڵەكە رەشە) لە فیستیڤاڵێكی ئەڵمانیای رۆژاوادا خەڵاتی باشترین فلیمی دۆكیومێنتیی وەرگرت. فروغ دەربارەی ئەم خەڵاتە وتبووی " ئەم خەڵاتە هیچ گرنگ نەبوو بەلامەوە. من ئەو لەزەتەی كە پێویستم بوو لە كارەكەمم دیبوو. حەزئەكەی بووكێكم بدەنێ، بووك چیە؟ خەڵاتیش هەر بووكە." دەیەمین فێستیڤاڵی ئۆبەرهاوزن لە چواردەیەمین دەورەی خۆیدا گەورەترین خەڵاتی خۆیی بۆ فلیمە دۆكیومێنتییەكان بە ناوی فروغی فەرروخزادەوە ناو نابوو. ساڵی ١٣٤٣ فروغ لە بەرهەم هێنانی فلیمی ( خشت و ئاوێنە) دا هاوكاریی كرد و هەمان ساڵیش سەفەری ئەڵمانیاو فەرەنساو ئیتالیای كرد. فروغ لەهەموو بوراەكانی هونەردا ئامادەیی یەكی زۆر چاكی هەبوو. لەشانۆشدا دەوری بینی بوو.

پاییزی ١٣٤٤ دوو فلیم دەربارەی ژیانی فروغ ئامادە كرا. یونیسكۆ فلیمێكی نیوسەعاتیی ئامادەكرد و بیرناردۆ بیرتلۆجیش فلیمێكی پازدە دەقیقەیی بەرهەم

---

[٣٦] گفتوگۆی فروغ لەگەڵ گۆڤاری روشنفكر، ساڵی ١١، ئەسفەندی ١٣٤٢

هێنا. ساڵی ١٣٤٥ فروغ سەفەری ئیتالیای كردو لە فیستیڤاڵی فلیمی پیزارۆ دا بەشداری كرد.

لەگەڵ ئەم هەموو چالاكییە بەسوودانەشدا فروغ لای وابوو دەیتوانی زیاتر داهێنانی هەبێ. "واهەست ئەكەم تەمەنم لەدەست داوە و زۆر كەمتر لەوەی ئەبێ بزانم دەزانم. رەنگە لەبەر ئەوەبێ هەرگیز ژیانێكی مەعلوومم نەبووە. ئەو ئەوین و شووكردنە مەسخەرەیەی شازدە ساڵی بناغەی ژیانی داهاتوومی لەرزۆك كرد. من هەرگیز لە ژیانمدا رێنمایەكەم نەبووە. كەس ئامۆژگاری فیكری و رۆحی نەكردووم. هەرچییەكم هەیە هی خۆمە. هەرچییەكم نیە هەموو ئەو شتانەن كە دەمتوانی هەمبێ. بەڵام لارێ كردن و خۆنەناسین و گرێكوێرەی ژیان رێگەیان نەداوە پێبگەم."[٣٧]

لەگەڵ هەموو ئەم مەشغوولییەدا نەیدەتوانی كورەكەی لەبیر بباتەوە و سەرەنجام بۆ پڕكردنەوەی جێگەی خاڵیی كورەكەی منداڵێكی بەكوری خۆی قبووڵ كرد. " كاتێ ساڵی ١٣٤١ بۆ وێنە گرتن و ئامادەكردنی فلیمی ( ماڵەكە رەشە) چووبووە تەبرێز حسەینی دۆزیەوە. حسەین كوری ژن وپیاوێكی گەڕ بوو لەگەڵ دایك و باوكی لە گەڕخانەی مەشهەد دەژیا. بە رەزامەندی دایك و باوكی كورەكە، فروغ حسەینی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ تاران و لەباتی كامی ی كوری داینا و ناوی نا ئەسفەندیار." دەڵێن فروغ لەم بارەیەوە وتوویەتی : فیكر و خەیاڵی كامی ئارامی لێبریبووم، كوشتبوومی، لەناخەوە دەیكرۆشتم. كە حسەین هات حاڵم باشتر بوو. ئەوی راستی بێ جارجار لە دەموچاوی ئەم منداڵەدا كامی دەبینم. كاتێ دەستی دەخەمە ناودەستم و دەست بە قژیدا دەهێنم ناتوانم بڵێم ئەمە حسەینە یا كامی.جیاوازیی نیە، واهەست ئەكەم كورمە."[٣٨]

---

[٣٧] نامەی فروغ، ئارش، ژمارە ١٣، ئەسفەندی ١٣٤٥

[٣٨] هەفتەنامەی بامشاد، ٣٠ی میهری ١٣٤٧

ساڵی ١٣٤٣ فروغ کتێبی ( لەدایکبوونێکی تر)ی بڵاوکردەوە. بەم کتێیە دەری خست زمانی خۆیی دۆزیوەتەوە و شیعر وتنی سەرلەنوێ لەدایك بۆتەوە. بەڵام هەستی کەماڵ پەرستیی کە لەو– و لە هەموو هونەرمەندێکی تر– دا هەبوو نەیدەهێشت بەم کتێبە رازی بێ. "من لەبارەی ئیشەکانی خۆمەوە قازییەکی زاڵمم. کاتێ سەیری کتێبی لەدایکبوونێکی تر دەکەم حەسرت دەخۆم. بەری چوار ساڵ ژیان؟ زۆر کەمە. راستە من ترازووم نەگرتووە بەدەستەوە بۆ کێشانی شیعرەکانم بەڵام چاوەروانی لەوە باشترم لە خۆم دەکرد و دەکەم. شەو کە ئەمەوێ بچمە ناوجێ لە خۆم ئەپرسم: ئەمرۆ چیت کرد؟ ئەمەوێ بلێم عەیبی ئیشی من ئەوەیە ئەکرا زۆر لەوە باشتر بێ و زۆر باشتر گەشە بکا. بەڵام من لە جیاتی ئەوەی یارمەتی بدەم رێم پێگرتووە بە تەمەڵی و پشت گوێ خستن و شان هەڵتەکاندن و نائومێدی فەیلەسووفانە و بێماناو دڵساردی کە ئەنجامی بیرتەنگی و هەبوونی چاوەروانیی کەرانەیە لە ژیان. موشکیلەی کاری من ئەوەیە کە هێشتا ئەوەی ئەمەوێ بیڵێم ناتوانم بیڵێم. من تەمەڵم ، زۆر تەمەڵم، هەمیشە لەلایەنە ئیجابییەکانی وجوودی خۆم هەڵدێم و خۆم تەسلیمی لایەنە سەلبییەکانی ژیان دەکەم.

من تەمەنم سی ساڵەو بۆ ئافرەت سی ساڵی تەمەنی کامڵی یە، هەرچۆنێك بێ جۆرێك کەماڵ. بەڵام ناوەرۆکی شیعری من سی ساڵە نیە، منداڵترە. ئەمە گەورەترین عەیبی کاری منە. پیاو ئەبێ بە هۆشیاری و هەستەوە بژی، من خەیاڵ بووم، پەروەردەی فیکریم لەسەر بناغەیەکی راست نەبووە. پچرپچر خوێندوومە و پارچە پارچە ژیاوم و ئەنجامەکەشی ئەوەیە درەنگ بێدار بوومەتەوە– ئەگەر ئەم قسانە بە بێداری دابنرێن–. من هەمیشە زیاترین باوەرم بە دواشیعرم هەیە. ماوەی ئەم باوەرەش زۆر کورتە. زۆر نابا لێی بێزار دەبم و هەموویم بەشێوەیەکی ساویلکانە دێتەبەرچاو.

من چەندین مانگە لە لەدایکبوونێکی تر جودا بوومەتەوە. بەڵام لەوباوەرەدام دەکرێ لە دوا بەشی شیعری لەدایکبوونێکی ترەوە دەست

پێبكرێتــەوە، جۆرێـك دەسـت پـێكردنی فیكـری. هەسـت دەكـەم دەتـوانم لـە ( پەرییەكەی غەمگین كە ماڵی لە ئۆقیانوسە ودڵی لە جووزەلەیەكی داریندا دەچرێ) ـەوە دەست پێبكەمەوە."[٣٩]

فروغ بە كتێبی ناتەواوی ( باوەڕبێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما) كە پـاش مردنی بڵاو بووەوە ئەو دەست پێكردنەی هێنایە گـۆڕێ و بەمـەش تـوانی تەنانـەت شاعیرە گەورەكانی سەردەمی خۆشی سەرسام بكا، "بەلای منەوە شـیعری فروغـی فەرروخزاد شتێكی ترە. هەندی جـار شـیعری فـروغ بـەلای منـەوە وەك مـوعجیزەی لـێدێ و ئەو بە یەكێك لە كەڵەشـاعیرەكانی ئـەم سـەدەیەی جیهـان دەزانم. زۆر لـە شاعیرانی بەناوبانگی جیهان كە بە مەزنترین دادەنرێن بەلای منـەوە هێـشتا زۆریـان ماوە بـە فـروغ بگەنـەوە. زۆرجـار رێكـەوتووە لەهەنـدێ دێـرە شـیعری فـروغ تـەواو حەپەساوم یان تەنانەت زۆرم پێچووە تا بتوانم باوەڕیان پێبكەم."[٤٠]

شیعر بەلای فروغەوە وەك پێویستییەكی ژیـانی لـێ هـاتبوو وەك پێویـستی مرۆڤ بە هەناسەدان. " ئەو سەردەمە واتە پێش ١٣٤٢ باوەرم بە شیعر نـەبوو. ئـەم باوەرنەبوونەش چەند قۆناغێكی هەبوو. سـەردەمێك مـن بـۆ خۆشـی و كەشـخەیی شـیعرم دەوت. كـاتی لەسـەوزە پـاكردن دەبوومـەوە پـشتی گوێـچكەم دەخورانـد و دەموت دەبا برۆم شیعرێك بنووسم. ئینجـا سـەردەمێك هـات هەسـتم دەكـرد ئەگـەر شیعر بڵێم شتێكم بۆ زیاد دەبێ. ئێستا ماوەیەكە كـە شـیعر دەڵـێم هەسـت دەكـەم شتێكم لـێكەم دەبێتـەوە. واتـە شـتێك لـەخۆم دەتاشـم و دەیـدەم بـە خوێنـەران. هەربۆیە شیعر وەك كارێكی جیددی لـێهاتووە بۆم، ئێـستا دەمـارگیرم بەرامبـەری. سەردەمێك كە شیعرم دەوت گاڵتەم پێی دەهات بەڵام ئێستا ئەكەر گاڵتـە بەشـیعرم بكەن توورە دەبم چونكە خۆشم دەوێ. ماوەیەكی زۆرم پێچووە تابتوانم ئەم شـتە كێوییە بۆ خۆم دەستەمۆبكەم و پاشانیش زۆر زەحمەتم كێـشا تـا بەناخمـدا بردمـە

---

[٣٩] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٣٩ بەدواوە

[٤٠] گفتوگۆی عەلی ئەسغەری زەررابی لەگەڵ ئەحمەدی شاملۆ، گۆڤاری فیردەوسی، فەروەردینی ١٣٤٥

خوارەوە و تێکەڵاوی بووم و بە جۆرێك ئاوێتەی یەك بووین کە جودا کردنەوەمان لەیەکتر ئاسان نەبێ."[٤١]

هەندێك دەڵێن شیعری فروغ دەنگی ئافرەتی دیلکراوە بەدرێژایی مێژوو. بەڵام فروغ خۆی باوەری بەم قسەیە نەبوو. شیعری فروغ چەند دەربری ئازارەکانی ئافرەتی سەردەمی خۆیەتی ئەوەندەش دەتوانێ دەربری ژانەکانی پیاو بێ. " ئەگەر شیعری من تارادەیەك حاڵەتی ژنانەی هەیە، ئەمە زۆر ئاسایی یە چونکە خۆم ئافرەتم. خۆشبەختانە من ئافرەتم بەڵام ئەگەر مەسەلە پێوانەی بەها هونەرییەکان بێ، ئیتر رەگەز دەور نابینێ. لەراستیدا ئەم شتە راست نیە. راستە ئافرەت بەهۆی سروشتی جەستەیی و هەستی و رۆحییەوە، بیر لە هەندێ شت دەکاتەوە کە رەنگە پیاو گرنگی پێ نەدا و دیدێکی ژنانەی هەبێ بەرامبەر هەندێ مەسەلە کە لەگەڵ دیدی پیاودا جیاواز بێ. من لەوباوەرەدام ئەو کەسانەی کاری هونەری هەڵدەبژێرن بۆ دەربرینی وجوودی خۆیان، ئەگەر بێتو رەگەزی خۆیان بکەنە سنوورێك بۆ کارە هونەرییەکانیان، ئەوا لەوباوەرەدام هەمیشە لەوئاستەدا دەمێننەوە و ئەمەش راست نیە. من ئەگەر وا بیر بکەمەوە کە لەبەر ئەوی ئافرەتم ئەبێ هەمیشە دەربارەی ئافرەتایەتی خۆم قسە بکەم، ئەم کارە وەك شاعیر نەك وەك مرۆڤ، دەبێتە هۆی راوەستان و جۆرێك پووکانەوە. چونکە ئەوەی کە ئاشکرایە ئەوەیە پێویستە مرۆڤ لایەنە ئیجابییەکانی وجودی خۆی بەجۆرێك پەروەردە بکا بگاتە ئاستی بەها مرۆیی یەکان. بنچینەی کار مرۆڤە، ئافرەت و پیاو گرنگ نیە. بەهەر حاڵ من کە شیعر دەڵێم ئەوەندە بیر لەم مەسەلەیە ناکەمەوەو ئەگەریش شتێك هەبێ زۆر بێئاگایانەیە، ناچارییە."[٤٢]

---

[٤١] گفتوگۆی سەدرەدینی ئیلاهی لەگەڵ فروغ، گۆڤاری سپید و سیاه ، ئەسفەندی ١٣٤٥

[٤٢] گفتوگۆ لەگەڵ فروغ، ل ٢١–٢٢

ئەو ژانەی لە هۆنراوەی فروغ دا شەپۆل دەدا ژانی بەسۆی مرۆڤی سەردەمی خۆیەتی، ئەو مرۆڤەی کە پاش شۆرشی پیشەسازی لە چوارپیانی زەوالی بەهاکانـدا وەستاوە و ئـەم سـزا دژوارە هێـزی لاَبریـوە. فـروغ ئەگـەر شـیعر دەڵـێ بەرخۆدانـە لەبەرامبەر ئەم زەوالەدا و کۆڵ نەدانە لەبەردەم زەوالی مەزندا – واتە مـەرگ: " لـە سەردەمێکدا دەژین کە هەموو پێوەر و چەمکەکان خەریکن مانای خۆیـان لەدەسـت دەدەن و خەریکن – نامەوێ بڵێم بێنرخ– لـەرزۆك دەبـن. دنیـای دەرەوە ئەوەنـدە ئاوەژووە نامەوێ باوەری پێبکەم.

من ناتوانم بڵێم بۆچی شیعر دەڵـێم. وابـزانم هـەموو ئەوانـەی کـاری هونـەری دەکـەن ، هۆیەکـەی – یـا لانـی کـەم یـەکێ لـە هۆیـەیکانی– جۆرێـك پێویـستیی بەئاگایانەیە بۆ رووبەرووبوونەوە و راوەستان لەبەردەم مەرگدا. ئەمانـە مرۆڤـانێکن ژیانیان زیاتر خۆش دەوێ و تێی دەگەن، هەروەها مردنیش. کاری هونـەری جـۆرە هەوڵێکە بۆ مانەوە یان هێشتنەوەی (خود) و رەتکردنەوەی مردن.

هەندێ جار دەڵێم راستە مردنیش یەکێکە لەیاساکانی سروشت، بـەلاَم مـرۆڤ تـەنیا لەبـەردەم ئـەم یاسـایەدا هەسـت بـە بـچووکی و کـەمیی خـۆی دەکـات. مەسەلەیەکە هیچ چـارەی نیـە. تەنانـەت ناشـکرێ بـۆ لـەناوبردنی هـەوڵیش بـدرێ، کـەڵکی نیـە، ئـەبێ هـەبێ، زۆر باشیـشە. ئەمـە لێکدانەوەیـەکی گـشتییە و رەنگـە گێلانەش بێ."[٤٢]

فروغ جارێك هەوڵی خۆکشتنی داوە، " پێنج شەش سـاڵ لەمەوبـەر( ١٣٤١– ١٣٤٢) فروغ جارێك هەوڵی خۆکوشتنی دا. بە یەکجار شووشەیەك حـەبی گاردینـاڵی خواردبوو. دەمەو خۆراوا کارەکەرەکەی پێی زانیبوو و بردبوویان بۆ نەخۆشخانەی ئـەلبورز. کـە ئێمـە گەیـشتینە نەخۆشـخانەفروغ بێهـۆش بـوو. کـە رزگـاری بـوو، هەرچـەند لـێم پرسـی بـۆ هـەوڵی داوە خـۆی بکـوژێ هـیچ قـسەی نـەکرد. بـەلاَم کارەکەرەکەی پێی وتبن ئەو رۆژە لەگەڵ گوڵستان شەری کردووە و فروغ پاش ئەو

---

[٤٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو

شەرو دەمەقاڵەیە حەبەکانی خواردووە. فروغ لە رووی رۆحییەوە سەقامگیر نەبوو، مانگی دوو سی جار تووشی کێشەی دەروونی دەبوو. لەو کاتانەدا خۆی لەهەموو شت و هەموو کەش بە دوور دەگرت. دەرگای لەخۆی دادەخست و دەگریا."[٤٤]

فروغ لە یەکێ لەم گۆشە نشینییانەیدا دەڵێ " مێشکم لێڵ و دڵم گیراوە.ئیتر بێزاربووم لەوەی هەر تەماشاچی بم. هەرکە دەگەمەوە ماڵ و بەتەنیا دەمێنمەوە کتوپڕ واهەست دەکەم تەواوی ئەورۆژەم بەسەرگەردانی و ونی لەناو حەشاماتێکدا بەسەربردووە کە هی من نین و نامێننەوە. لەناو ئەم هەموو مرۆڤە جۆراوجۆرەدا ئەوەندە هەست بەتەنیایی دەکەم جاری واهەیە قورگم وەختە لەداخا بتەقێ."[٤٥] دڵتەنگی و تەنیایی فروغ بێپایان بوو ،"دڵم گیراوە..گیراوە..گیراوەو لێرە تەواو تەنیا کەوتووم. ئێوە هەمووتان رۆشتوون. دایکم هەمیشە غەمگینەو باوکیشم مەگەر بەس سەلامی لێبکەم. ئێستاش کە ئێستایە هەندێ جار دادەنیشم و دەگریم."[٤٦]

هەندێ کەس ئەیانویست عیشقی فروغ وەك رابواردنی باوی ژیانی خۆیان سەیر بکەن بەڵام "بەبۆچوونی من هەموو ئەو شتانەی دەربارەی پەیوەندی عاشقانەی فەرروخزاد وتراوە هەموو قسەلۆکن. فەرروخزاد ئەوەندە مرۆڤێکی تەنیاو ماندوو بوو ناچار بەدوای پەناگەیەکی رۆحیدا دەگەرا. سروشتییە چونکە هەر مرۆڤێك مەبەستێکی هەیە و بۆ مەبەستێك دەگەرێ. بەڵام هەستی مەرگ و تەنیایی و بێتوانایی جەوهەری فیکریی فەرروخزاد پێك دەهێنن. هەربۆیەشە شیعرەکانی مانایەکی سەیریان لەگەڵ مردنیدا پەیدا کردووە. ئەو بەراستی نەیدەزانی لەدووی چییە. بەدوای زۆردا نەدەگەرا و رەنگە لەسەردەمی ئاشنایەتیی لەگەڵ گوڵستاندا ( ئیبراهیمی گوڵستان) بەهۆی کەللەرەقی یان نائومێدییەوە، سەرنجی یەك دوو کەسی تریشی دابێ، بەڵام دڵنیام ئەم بایەخ دانە هەرگیز لەرادەی هاورێیەتی پاك و

---

[٤٤] پورانی فەرروخزاد، هەفتەنامەی بامشاد، ئابانی ١٣٤٧

[٤٥] نامەی فروغ، ئارش، ژ ٣، ئەسفەندی ٤٥

[٤٦] نامەی فروغ، گۆڤاری فیردەوسی، ٢٧ی مورداری ١٣٤٧

دڵسۆزانە تێنەپەریوە چونکە فەرروخزاد بەهۆی ئەو ئەزموونە تاڵەوە کە لە رابوردوو و خەڵکانی رابوردووی خۆی دیبووی، تەنیا لەدووی ئەوە بوو یەکێك بدۆزێتەوە بیکا بە پاڵپشت وپەناگەی خۆی و بەس."[٤٧]

گەرچی فروغ لە لوتکەی کەماڵ دا بوو بەڵام وەك زۆربەی هونەرمەندان وەزعی مادیی گوزەرانی لە لانی کەمی پێویست بۆ ژیانێکی ئاسایی کەمتر بوو. "خۆم لە وەزعێکی مادیی خراپدام. زۆرجار لەناوەراستی مانگدا پارەم پێنامێنێ و کەسیشم نیە کۆمەکم بکا. ئێستا ناوەراستی زستانە و هێشتا زۆپام نیە. لەتاو تەنیایی وەك سەگ ئیش دەکەم. ژیان هەروایە... هەمیشە تەنیایت و تەنیایی بن کەنت دەکا و دەتهارێ. من قیافەم زۆر تێکشکاوە و پرچم لێی سپی بووە و خەیاڵی داهاتوو دەمترسێنێ."[٤٨]

" کێ ئەزانی فروغ بەراستی چی بوو، کێ بوو؟ بێجگە لە سێ چوار کەس کە بەردەوام لەدەوروبەری بوون. کێ ئاگای لە گریان و حاڵاتی غەمگینانەی ئەو هەبوو؟ کێ دەزانێ جاری واهەبوو فروغ چەندین هەفتە نەخۆش بوو و پارەی دکتۆر و دەرمانی نەبوو؟ یان زستانان لە ناوەراستی مانگا بەهۆی نەبوونی نەوت و بێپارەیی یەوە زۆپای دانەدەگیرساند؟ فروغ ئەو پارەیەی کە دەبوایە نەوتی پێبکرێ ئەیدایە پای خوێندنی من لە ئەڵمانیا، یان لەو منداڵەدا سەرف دەکرد کە کە لە گەرخانە هێنابووی و کردبووی بەمنداڵی خۆی، یا ئەیدا بە کەسێ کە لەخۆی نەدارتر بوو. ئینجا بە سەعات و بەرۆژ لە ناو ژوورە دەرگاداخراوەکانیماڵەوەیدا دادەنیشت و بیری دەکردەوە، شیعری دەنووسی و ژیانی خۆیی تێدا شی دەکردەوە. لە زۆربەی نامەکانیدا ئەم رستەیە دەبینرێ: ئێوە هەمووتان رۆشتوون و من لێرە تاك و تەنیا کەوتووم و وەختە لە تەنیاییدا بمرم."[٤٩]

---

[٤٧] م. ئازاد، هەفتەنامەی بامشاد، ١٣٤٧/٦/١٩

[٤٨] نامەی فروغ، گۆڤاری فیردەوسی، ٢٧ی موردادی ١٣٤٧

[٤٩] ف.فەرروخزاد، گۆڤاری فیردەوسی، ٢٧ی موردادی ١٣٤٨

هەرچەندە لە کۆتایی ژیانیدا بەهۆی کارە سینەمایی یەکانیەوە تارادەیك گوزەرانی باشتر بووبوو بەڵام –بە پێچەوانەی زۆر لە ژنانی سەردەمی خۆیەوە– هیچ نرخی بۆ پارە دانەدەنا و حەزی لە سادەیی بوو. "سەرو وەزعی رواڵەت بەلایەوە گرنگ نەبوو. سادەی دەپۆشی و موستیلەو بازنی نەدەکرد بەخۆیەوە. ئەم کارانەی بە بچووك دەزانی."[٥٠] " تەنیا شتێك کە بیری لێ نەدەکردەوە پارەبوو. کە مرد تەنیا ٣٧ تومان و٨ ریاڵ و یەك پاکەت جگەرەی لێ بەجێما."[٥١]

لەگەڵ ئەوەشدا سەلیقەی هونەرمەندانەی خۆی لەگەڵ ئەم سادەیی و خاکێتیەدا تێکەڵ دەکرد ورەنگێکی تایبەتی دابوو بە ژیانی، "زۆر جوان و بەسەلیقەو کەمێ رۆشنبیرانە ماڵەکەی رازاندبۆوە. دیاربوو ماڵەکەی خۆش دەوێ. ژووری میوانی بچووك بوو، بە هەندێ شتی بچووکی جوان رازاندبوویەوە. یەك دوو تابلۆی وێنەشی بە دیواردا هەڵواسی بوو کە بیرم نەماوە دەسکردی کێ بوون."[٥٢]

فروغ خۆشی دەستی وێنە کێشانی هەبوو و "زۆر بە ئاسانی لە وێنەکێشان تێدەگەیشت و هەستی پێدەکرد. زۆرباش رەنگەکانی دەناسی. لە هێڵکاریدا لێهاتوو بوو. یەك دوو مانگ پێش مردنی دووبارە بای دابۆوە بەلای وێنە کێشانداو بۆیەو فڵچەو شتی تری کری بوو. دوو تابلۆی بە بۆیەی زەیتی کێشا کە یەکێکیان پۆرترەیەکی حسەین بوو– کوری ژنێکی گول– کە فروغ کردبوویە کوری خۆی."[٥٣]

لە بواری مۆسیقادا جگە لە مۆسیقای رۆژاوایی فروغ مەیلێکی تایبەتی لە مۆسیقای ئێرانی بوو، " مۆسیقای ئێرانی لەرووی ئەو خەم و خەفەتەی کە تێیدایە، حەزم لێیەتی. من لە ئەسڵا حەزم لە خەفەتە و لەززەت لە ئازار وەردەگرم."[٥٤]

---

[٥٠] قسەی ئەمیرمەسعودی فەرروخزاد بۆ رۆژنامەی کەیهان، ١٣٥٣/١١/٢٤

[٥١] ف. فەرروخزاد، گفتوگۆ لەگەڵ رۆژنامەی کەیهان، ١٣٥٣/١١/٢٤

[٥٢] م. ئازاد، هەفتەنامەی بامشاد، ١٩ی شەهریوەری ١٣٤٧

[٥٣] گۆڤاری زن روز، ١٣٤٥/١٢/١٦

[٥٤] نامەی فروغ، گۆڤاری خوشە، نەورۆزی ١٣٤٦

فروغ لەتەمەنی ٣٢ ساڵیدا وا بیردەکاتەوە " خۆشحالم کە پرچم سپیی بووە و تەوێڵم خەتی تێکەوتووە و لە نێوان برۆکانمدا دوو لۆچی گەورە لە پێستمدا پەیدا بوون. خۆشحاڵم کە چیتر خەیاڵاتی و خەوناوی نیم. ئیتر وا خەریکە ئەبم بە ٣٢ ساڵ، گەرچی کە دەبی بە ٣٢ ساڵ مانای ئەوەیە ٣٢ ساڵت لە بەشە ژیانی خۆت خستۆتە لاوە و تەواو کردووە. بەڵام لەپای ئەوە خۆمم ناسیوە."[٥٥] لە شوێنێکی تردا دەڵێ "من لە دنیادا هیچ ئارەزوویەکی ترم نیە. واهەست دەکەم هەموو ئاواتەکانم هاتوونەتە دی. بەڵام ئەشزانم، یان رەنگە لام وابێ، مرۆڤ ئارەزووی نەبێ ئەمرێ. ئەمەش بەراستی ترسناکە. زۆر ترسناکە. ئەترسم کورەکەم نەبینم. ئەمەش زۆر ترسناکترە."[٥٦] " هەندێ جار وادەزانم هەر لەحزەیەك رەنگە بتوانم ئەم ژیانە بەجێ بهێڵم چونکە دڵم بەهیچ خۆش نیە."[٥٧] زووتریش وتبووی " دەترسم پێش ئەوەی خۆم بۆی دەچم بمرم و کارەکانم بە نیوە ناچڵی بمێننەوە."[٥٨]

سەرەنجام دوارۆژی ژیانی فروغ ( دووشەممە ٢٤ی بەهمەنی ١٣٤٥) هاتە پێش. " دوا رۆژ کە پێکەوە نانی نیوەرۆمان خوارد کاتژمێر سێی عەسر بوو. من هەستام برۆم بۆ ئیش، ویستم ئەویش بگەیەنم، وتی: تۆ ئەوەندە هێواش دەئاژۆی پیاو حەوسەڵەی نامێنێ. ئینجا بەو ئۆتۆمبیلە رۆیشت کە لە ستۆدیۆوە ناردبوویان بە شوێنیدا."[٥٩]

فروغ لە ژیانیدا شەیدای خێرایی بوو"بۆ من تەنیا مەسەلەی خێرایی لە ئارادابوو. وەك بڵێی ئەم خێرایی یە وەلامێکە بۆ سەرکوتی و خامۆشی دەروونم و دام دەسەکنێنێ. کاتێ بە خێرایی دەرۆم ناتوانم بیر لە هیچ شتێك بکەمەوە. ئەمەشم بەلاوە خۆشە. هەست دەکەم باری بەرپرسیارێتییەکی گەورە لەسەرشانم

[٥٥] نامەی فروغ، ئارش، ئەسفەندی ١٣٤٥

[٥٦] گفتوگۆی فروغ، گۆڤاری روشنفکر، ساڵی ١١،ئەسفەندی ١٣٤٢

[٥٧] نامەی فروغ، گۆڤاری فیردەوسی، ٢٧ی موردادی ١٣٤٨

[٥٨] هەمان سەرچاوە

[٥٩] قسەی محەمەدی فەرروخزاد بۆ کەیهان، ١٣٥٣/١٢/٢٤

لادەچێ. خۆم لەو خێراییە یەدا بەرەڵا دەکەم کە بەگورجی بەرەو پێشم دەبا. ئەم تەیکردنی رێگەیە بۆ من وەك نەفەس تازەکردنەوە وایە."[٦٠]

کاتژمێر سێی پاش نیوەرۆ، دوو شەممە ١٣٤٥/١١/٢٤ ( رێکەوتی ١٩٦٧/٢/١٣ ز) ، فروغ بە خێرایی " بەرەو ستۆدیۆ دەچوو. فروغ مندالّ و پەلەوەری زۆر خۆش دەویست. دەیوت ئەمانە پاکترینن. سەرەنجامیش گیانی خۆیی لەپێناوی ئەو خۆشەویستیەی مندالّ دا دانا. ئەو کە هاورێی دێرینی منداڵان بوو کاتێ کە بینی ئۆتۆمبیلی قوتابخانەی شەهریاری ناوچەی قولهەك لەبەردەمیدا قوت بووەوە، بۆ ئەوەی خۆی پێدا نەکێشێ لای دا بەلای راستا و لەجادەی سەرەکی دەرچوو. تەنیا زەردەخەنەی یەك مندالّ کە لە مردن قوتار بوو بوو بۆ فروغ بەس بوو. لەپشتی شووشەی ئۆتۆمبیلەکەی خۆیەوە دەیبینی منداڵەکان بەترسەوە دەڕواننە ئۆتۆمبیلەکەی ئەم. ئۆتۆمبیلەکەی لە رێگە دەچوو بەلاّم هەر نەیتوانی خۆی لە پێدادانی ئۆتۆمبیلی قوتابخانەکە لابدا. خۆی پێدا کێشا بەلاّم زۆر بەهێز نەبوو. بەهۆی ئیستۆپە توندەکەوە سەری فروغ کێشای بە جامی پێشەوەی جێبەکەیدا و لووتی لە ناوەراستا برینداربوو. دەرگای جێبەکە کرایەوە و فروغ و خزمەتگوزاری ستۆدیۆی گوڵستان، کە لە پشتەوە دانیشتبوو، هەردوکیان پەڕینە دەرەوە. سەری فروغ بەر دەرگاکە کەوت و گوێچکەی چەپی بەسەختی بریندار بوو، ئەوەندی نەمابوو لێ‌ببێتەوە. ئینجا فروغ کەوتە سەرجادە و سەری کێشای بە جۆگەی رۆخی جادەکەدا و شکا. گەیاندیانە نەخۆشخانە بەلاّم ئەفسووس، کار لە کار ترازابوو."[٦١]

پاش نیوەرۆی چوارشەممە، ٢٦ی بەهمەنی ١٣٤٥، خاکی وەرگر –کە ئیشارەت بوو بە خامۆشی– بەو دەمە سارده مژەرەیەوە– کە شێوەی گۆری وەرگرتبوو، هەڵی لووشی. " ئەمبولانسێکی سپیی بە گوڵداپۆشراو هێواش هێواش

---

[٦٠] فروغی فەرروخزاد، بیرەوەرییەکانی سەفەری ئەوروپا، گۆڤاری فیردەوسی، ساڵی نۆیەم

[٦١] مەسعودی بیهنود، گۆڤاری روشنفکر، ئەسفەندی ١٣٥٣

لە جادەی گۆرستانی زەهیروددەولە نزیك دەبێتەوە. ورتە ورتە و گریان. تەرمەكە لە ئەمبولانس دەردەهێنن. فروغ، ناسك وەك شیعرەكانی، لە ژێر شاڵی سەر تابووتەكەدا راكشاوە. ئەحمەدی شاملۆ و سیاوەشی كیسرایی و مەهدی ئیخوان سالیس و هوشەنگی ئیبتیهاج( سایە) و ساعیدی و چەند كەسێكی تر تابووتەكەیان لەسەرشان گرتووە. دیسان باران دەست پێدەكاتەوە و فرمێسكیش. بەڵام هاواری سەڵەوات گوێی لەو دوانە نیە. تەرمەكە لەسەر شانی ئەوچەند نەفەرە تا گۆرستان دەبرێ و لەكەناری گۆرەكەدا دادەنرێ.

كام لوتكەیە، كام بەرزایی؟
مەگەر هەموو ئەم رێگە پێچاوپێچانە
لەو دەمە ساردە مژەرا
پێك ناگەن و تەواو نابن؟[٦٢]

كاری گۆرهەڵكەن وا تەواو دەبێ. ئەوا خەریكن بە خشت و گەچ گۆرەكە هەڵدەچنن. فروغ هێشتا لەژێر شاڵی تابووتەكەدا چاوەرێی گۆرە. لە ژێر شاڵەكەوە دەتوانی دەستەكانی بناسیتەوە. دەنگی گۆرهەڵكەن بەرزدەبێتەوە. ئینجا دەنگی سەڵەوات و پاشان هەڵگراتی تەرم بۆ ناو گۆر. چەند ساتێ باران هێور دەبێتەوە، ئەوەندەی شاڵەكە لەسەر جەنازەكە لابەرن. پاشان بەفر، بەفرێكی پاكی سپی لە ئاسمانەوە دادەكا، سپیتر لە كفنەكەی ئەو. ئەو كە بەرگی سپی پۆشیوە بەئارامی دەخرێتە ناو گۆر. بەفرێكی سپی زەوی و گۆرەكەی ئەو دادەپۆشێ."[٦٣]

حەقیقەت رەنگە ئەو دوو دەستە لاوە بێ
كە كەوتە ژێر بەفری باریوی پەی دەر پەی
باوەر بێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما

[٦٢] هۆنراوی لەدایكبوونێكی تر
[٦٣] پەروێزی لوشانی، گۆڤاری سپید وسیاە، ئەسفەندی ١٣٤٥

باوەر بێنین بە وێرانیی باخی خەیاڵ

بە داسی ئاوەژووی بێکار

بە تۆوی دیل

شا ! چۆن بەفرێ وا دێتە خوار[٦٤]

*********

[٦٤] هۆنراوەی باوەربێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما

دوو شیننامە بۆ فروغ

## شیوەن

ئەحمەد شاملۆ

بەدوای تۆدا
لەبەردەرگای کێو دەناڵم
لەسەرئاستانەی دەریاو گیا

بەدوای تۆدا
لەسەر رێگەی با دەناڵم
لەسەر چوارڕیانی وەرزەکان
لە چوارچێوەی شکاوی پەنجەرەیەکدا
کە ئاسمانی هەورداگرتوو
لە چوارچێوەی کۆنە دەگرێ

لە چاوەروانیی وێنەی تۆدا
ئەم دەفتەرە خاڵییە
چەندین و
چەندین
لاپەرە هەڵدەداتەوە؟

قبووڵ کردنی رەوتی باو
خۆشەویستی

کە خوشکی مەرگە.

نەمری

رازی خۆیی

بۆ تۆ ئاشکرا کرد

بەوجۆرە بوویتە گەنجێك

بەنرخ و تەماعگیر

گەنجێك لەو چەشنە

کە مولْکداریی خاك و هەواری

لەو کاتەوە

دڵگیر کردووە

ناوت سپێدەیەکە بەسەر تەوێڵی ئاسماندا تێدەپەڕێ

پیرۆز بێ ناوی تۆ

وە ئێمەیش هێشتا

دەبەینە سەر

شەوو رۆژ، و

ئێستا

****

١٣٤٥/١١/٢٩

## هاوڕێ

سوهراب سپیهری

مەزن بوو
خەڵکی ئەمڕۆ بوو
هاوپەیوەند بوو لەگەڵ گشت ئاسۆ والاکان
لە ئاوازی ئاوو زەویش چەند بە باشی تێدەگەیشت
دەنگی بە شێوەی خەمی پەرێشانی واقیع بوو
پێڵوەکانیشی ڕێرەوی ترپەی توخمەکانیان
نیشانی ئێمە دەدا
دەستەکانیشی هەوای پاکی سەخاوەتیان هەڵدایەوە و
میهرەبانییان
بەرەولای ئێمە هەڵفڕاند

بە شێوەی خەڵوەتی خۆی بوو
عاشقانەترین چەمینەوەی سەردەمی خۆیی
بۆ ئاوێنە لێکدەدایەوە
وە وەک باران پڕ لە تازەیی تیکرار بوو
وەک درەختیش
لەناو سەلامەتیی نوورا پەخش دەبوو
هەمیشە بانگی لە منداڵیی با دەکرد
هەمیشە ڕشتەی قسەکانی
لەگەڵ کێلوونی ئاودا گرێ دەدا

شەوێ

چەند ئاشكرا

سجوودی سەوزی خۆشەویستیی

بۆ ئێمە ئەنجام دا

كە ئێمە دەستمان هێنا بەسەر سۆزی ڕووتی خاكا و

وەك لەهجەی سەتڵێك ئاو تازە بووینەوە

چەند جار دیمان

بەو هەموو سەبەتەیەوە

بۆ چنینی یەك هێشووە ئومێد ڕۆیی

بەڵام نەكرا

لەبەرامبەر ئاشكرایی كۆترەكانا دابنیشێ

ڕۆیشت هەتا كەناری هیچ

لەپشت حەوسەڵەی ڕۆشنایی یەكانەوە ڕاكشا

هیچ بیریشی نەكردەوە

ئێمە لەناو پەرێشانیی

دەربرینی ژانەكانا

بۆ خواردنی یەك سێو

چەند تەنیا كەوتووین

****

## پاییز

نووقاندووومە دوو چاوی پڕ خەمم
لەسەیری رووی سروشتی ئەفسوونکار
نەوەک لەم جلوەی حەسرەت و خەمە
بڕوانێ نیگای منی دەردەدار

پاییز ئەی رێبواری تا داگرتوو
لە باوەشتدا چیە پەنهانت
بێجگە لە گەڵای مردووی وشک بوو
لەم جیهانەدا چی یە سامانت

غرووبی قورس و تار و خامۆشت
بۆ دڵی شاعیر غەیری غەم چی یە
باوەشت غەیری ساردی و بێزاری
بۆ گیانە دەردەدارەکەم چی یە

لە دامێنی خامۆشیی دڵتەنگتا
خەمێکی بزر ئەدا ئازارم
ئارەزوویەکی ون سەما ئەکا
لەپەردەی خەیاڵی نادیارم

پاییز ئەی سروودی خەیاڵاوی
پاییز تۆ ئەی گۆرانیی مەینەتبار
پاییز ئەی زەردە خەنەی خەماوی
لەسەر رووی تەبیعەتی ئەفسوونکار

******

کۆمەڵە هۆنراوەی ئەسیر

## خونچەی خەم

شادم لە گڕی تۆدا ئەسووتێم
شادم کە ئەگریم لە خەیاڵتدا
شادم پاش ژووان دیسان بەم جۆرە
ئەگریم لەعیشقی بێ زەوالـتدا

لات وابوو کاتێ لێت جوێ ببمەوە
چیتر بیری تۆ نایە بەسەرما
بەڵام چی بلێم غەیری ئەم گڕە
ئاگرێک نیە لە گیانی منا

شەوان کە بەلای دارخورماکانا
کاروون لە ژانی خۆیا هاژەی دێ
ئەڵێی هاواری حەسرەتی منە
لەشەپۆلی ماندووی دێتە بەرگوێ

شەو لەکەناریا دانیشە ساتێ
هەتا ببینی ژانی بەرجەستەم
ساتێ بنوارە سێبەری خۆت، شەو
هەتا ببینی گیانی بێ ئۆقرەم

بە لێوی ساردی نەسیمی بەیان
ئەچریکێنم گۆرانی بۆ تۆ
ئەو ئەستێرەیەم ئەدرەوشێمەوە
شەوان لەئاسمانی هەواری تۆ

باکم نیە گەر حەسارێکە بەرز
بەینی من و تۆ، جەستەی بیابان
من ئەو کۆترەم کە بەتەنیایی
دەفڕم بە پانتایی گشت دەریاکان

شادم کەدیسان وەک چڵێکی وشک
لە گڕی کینەی تۆدا دەسووتێم
دەڵێی هێشتا ئەو جەستە تادارەم
لەبەر هەتاوی تۆ هەڵ ئەقرچێم

لە دڵما یادی تۆ چۆن دەژاکێ
یادی تۆ یادی یەکەم ئەوینە
یادی ئەو خەزانە دڵگیرەیە
تێیدا هەزاران جلوەی رەنگینە

دەبا زاهیدانی دامەن سیا
پێم بڵێن رسوای کۆڕو شارانە

با ناوم ببەن بە نەنگ و عاری
خۆی كە خوڵقاوی دەستی شەیتانە

بەڵام ئەو خونچەی خەمەم من كەوا
لە چڵی یادی تۆوە دەروێم
لە تەنیایی دا شەوانە بۆ تۆ
لە یادی ئاشنای تۆدا دەگەڕێم

******

## دەعوەت

ئەفسوونی چاوەکانی من شێتی کردوویت و ئەیزانم
ئیتر بۆ بێهودە دەڵی ی دلێکت هەیە وەک ئاسن
مەگەر نازانی نازانی بێجگە لە چاوی پر ئەفسوون
لەئەم جامی لێوانەمدا بادەیەک هەیە پیاو تەزێن

بێهودە بۆ هەوڵ ئەدەی لە باوەشم تەوەللا بی
کە باوەشی سووتێنەر تر هەرگیز نابینی بە چاوان
مەگەر ناترسی ناترسی سەرەنجام ناوت بنووسن
لەسەر بەردی تەڵخی گۆڕێ لە کپ وخامۆشی شەوان

فیدای یەک ساتی شادی کە ئەم خەیاڵ و خەونەی وجوود
وەرە چ سوودی دنیا لەم پارێزکاری و دوور دەستی یە
لێوت وەسەر لێوی من نێ تا لەم پێکی پڕ شەرابە
وەهات مەست کەم لەبۆخۆت تێ بگەی قەدری مەستی چی یە

ئەفسوونی چاوەکانی من شێتی کردووویت و ئەیزانم
کەسەرتاپات لە ئاگری حەزێکی شێتا سووتاوە
گەر وانیە بۆ ئەو دوو چاوە راز درکێنەت بەردەوام
تیشکی نیگای لە چاوی دێوانەی منا قەتیس ماوە
******

## ژیان

ئەی ژیان لەگەڵ هەموو پووچیتا
من هێشتا دڵ پڕ خرۆشی تۆ بووم
نەپچڕاندنی پەتە خەیاڵم
نە هەڵاتنە خولیاو ئارەزووم

هەر هەموو گەردی جەستەی خاكیی من
لە تۆ ئەی شیعری گەرم، خرۆشاون
وەكوو ئاسمانی ساماڵی بێ گەرد
پڕ لە شەرابی گەرمی هەتاون

گوڵی نەستەرەن بە هەزاران زەك
گۆرانی وجوودی تۆ ئەخوێنێ
هەر شنە بایەك لە باخ هەڵ بكا
پیرۆزی تۆی پێ رادەگەیەنێ

من بۆ تۆ لەناو خۆتا گەڕاوم
نەوەك لە ناو خەونە خۆشەكانی
زۆر لە هەردوو دەستتا گەڕاوم
هەتاكوو پڕ بووم، پڕ بووم لە جوانی

پڕ بووم  لە گۆرانی گەلی  سپی
پڕ بووم  لە گۆرانی گەلی  سیا
لە هەزارەها  پریشکی  حەزو
لە هەزارەها  تروسکەی  هیوا

حەیف  لەو رۆژانەی کە وەکوو  دوژمن
من  بە ڕقەوە  ئەمڕوانی  بۆ تۆ
لام بێهودە بوو  بریق  و باقت
لێت بێ خەبەر مام ،  دامی  بە فیرۆ

وەک  ئاوی  ڕەوان  ئەدەم  بە لاتا
بێ خەبەر لەوەی  تۆ باقی و ئەمن
ڕێگەی  تاریکی مەرگ دەگرمە بەر
لەناو تەمی  زەوالا ئەبم  ون

ئاخ ئەی ژیان ئاخ ئەمن ئاوێنەم
لە تۆ  چاوم پڕ لە نیگا ئەبێ
ئەگینا ئەگەر مەرگ  تێم بروانێ
رووی ئاوێنەکەم رەش  هەڵ ئەگەرێ

عاشقم عاشقی ئەستێرەی بەیان
عاشقی هەورە سەرگەردانەکان

عاشقی رۆژانی باراناوی
عاشقی هەرچی ناوی تۆی تیان

بەم وجوودی تینووەم دەیمژم
خوێنی لەکوڵی ساتەکانی تۆ
ئەوەندە لەززەت لە تۆ وەرئەگرم
کەللەیی بکەم تا یەزدانی تۆ

*********

کۆمەڵە هۆنراوەی یاخی بوون

## شەوێ

شەوێ لەودیوی تاریکی یەوە
وەکوو هەتاوێ بەرەو لای تۆ دێم
لەسەر باڵی با جیهان گەڕەکان
بە شادمانی ئەڵوەدای تۆ دێم

سەراپام پڕی گەرمی و سەرمەستی
وەکوو رۆژی دڵکیری هاوینان
دێم و کۆشمت بۆ سیخناخ ئەکەم
پڕ لە گولاڵەی کێویی کوێستان

شەوێ لە تەقەی ئەڵقەی دەرگاکەت
دڵت لە کونجی سینگا دەلەرزێ
کە دەرگا وا بوو جەستەی شەیدای من
بۆ ناو باوەشی گەرمی تۆ دەخزێ

ئیتر لەو ساتە مەستی بەخشانا
غەفڵەت لەچاوی منا نابینی
وەک هی منداڵان نیگای کپی من
لە گیروداوی شەرما نابینی

شەوێ هەر هێندەی ناوی من بێنی
ئەتبەم بۆ جیهانێکی پڕ خولیا
لەسەر شەپۆلی یادت سەمام بێ
وەکوو کیژانی سرکی سەر دەریا

شەوێ لێوانی تینووم پڕ تاسە
لە ئاوری لێوی تۆدا دەسووتێن
ئومێدی نیگای چاوەکانیشم
لە دەوری نیگای تۆ دادەگیرسێن

لە زوهرە، لەو خوا عیشوەگەرەوە
ڕێوشوێنی ئەوین فێری خۆم ئەکەم
شەوێ وەک نوور لە تاریکی یەوە
لە ژوورەکەتا چەخماخە دەدەم

ئاه ئەی دوو چاوی مات و چاوەڕوان
بەڵێ منم وا بەرەو لای تۆ دێم
لەسەر باڵی با جیهان گەرەکان
بەشادمانی ئەڵوەدای تۆ دێم

******

## ئارەزوو

کاشکی لە کەنار چۆمێکی کپا
عەتری مەرموزی گیایەک ئەبووم
تا ئەگەر لەوێ تێپەڕیتایە
لە هەموو گیانت لێوم هەڵبسووم

کاشکی دەمچری وەک شمشاڵی شوان
ئاوازی دڵەکەی عەوداڵی تۆ
لەسەر باڵی پڕ شەپۆلی نەسیم
تێ ئەپەریم لای دەرکەی ماڵی تۆ

کاشکی وەک تیشکی هەتاوی بەهار
بەر بەیان دەم دا لە پەنجەرەی تۆ
لەپشتی پەردەی نەرمی ئاوریشم
ئەمبینی رەنگ و شێوەی دیدەی تۆ

کاشکی لە بەزمی پڕ جۆشی تۆدا
بزەی ناو پێکی مەیێ بوومایە
لەنیوە شەوێکی پڕ لە ژانا
خاوی و سەرخۆشی خەوێ بوومایە

کاشکی ڕوون ئەبوو وەکوو ئاوێنە
دڵم لە نەخش و پێکەنینی تۆ
بەربەیان بخزا بەسەر جەستەما
گەرمایی دەستی نازەنینی تۆ

کاشکی نیوە شەو وەک گەڵای خەزان
مانگ سەمای ئێمەی تەماشا ئەکرد
لە دڵی باخچەی ناو ماڵی تۆدا
خۆشی من سەیرانی بەرپا ئەکرد

کاشکی وەک یادی شیرینی ژنێ
دەخزامە دڵت بە پەشێواوی
لە پرێکا دەمبینی دووچاوت
لە جلوەی جوانیی من بە ڕاماوی

کاشکی لە نوێنی تەنیایی تۆدا
مۆمی گوناهی جەستەم دەگڕان
رەگی زوهدی تۆ و حەسرەتی منیش
لەم گوناهە شیرینا دەسووتان

کاشکی لە چڵی سەوزی ژیانا
گوڵی دڵتەنگیی منت دەچنی

کاشکی لە شیعری منا ، عەمرەکەم

گڕی نهێنی منت  دەبینی

******

کۆمەڵە هۆنراوەی دیوار

## گوناه

گوناهم کرد گوناهی پر لەلەززەت
لە پەنا جەستەی سەرمەست و لەرزیوا
خودایا نازانم چی بوو کە کردم
لەو خەڵوەتگە تاریک و بێ سریوا

لەو خەڵوەتگە تاریک و بێ دەنگەدا
ڕوانیمە نێو چاوانی کانگای ڕازی
دڵ لەسینەم بێ سەبرانە دەلەرزی
لە تکا کاریی چاوی پر نیازی

لەو خەڵوەتگە تاریک و بێ دەنگەدا
لە تەنیشتیا لـێی دانیشتم نیگەران
هەوەسی ڕشت بەسەر لێوانما، لێوی
خەمی دڵی دێوانەمی دەر پەران

بە گوێچکەیا خوێندم چیرۆکی ئەوین
کە تۆم دەوێ ئەی دولبەری شیرینم
ئەتۆم دەوێ ئەی باوەشی ژیان بەخش
تۆ ئەی عاشقی دێوانەی ئەوینم

لەچاوانیا گری  هەوەس  كڵپەی سەند
شەرابی  سوور  كەوتە سەما  لە پێكان
لە دوو توێی پێخەفی نەرما جەستەی من
لەسەر سینەی وەكوو مەست  كەوتە هەژان

گوناهم  كرد، گوناهی  پر  لە لە لەززەت
لە باوەشێكی  گەرم  و ئاگرینا
گوناهم  كرد  لە نێو  دوو بازووانی
گەرم  و كینە  لە دڵ و  ئاسنینا

******

## نائاشنا

وادیسان دڵێ کەوتە بەر پێی من
وا دیسان چاوێ ڕاما بە ڕووما
عیشقی من دیسان لە کۆڕی جەنگا
دڵێکی تری ساردی وەژێر نا

دیسان لە کانی لێوەکانی من
تینوویەکی تر تێراو بوو تێر ئەو
دیسان لە ناوجێی باوەشی منا
ڕێبوارێ لـێی نوست چاوی چووە خەو

لە دوو چاوانی دەڕوانم بە ناز
خۆشم نازانم وێڵی چیم لە دوو
عاشقێکی شێتم دەوێ کە گورج
واز بێنێ لە لە پایەو ماڵ و ئابروو

لە من شەرابی ماچی ئەوێ ئەو
چ بلێم بە دڵی پڕ لە هێڤیم من
ئەو لە بیری لەززەتاو نازانێ
لە دووی لەززەتی هەمیشەییم من

لەو بانگی ئەوینم ئەویٚ ئەمن
تا وجوودی خۆم بکەمە فیدای
ئەو لە من جەستەی ئاگرین هەتا
تیا بسووتێنیٚ پەشێویی ئێستای

ئەو بە من ئەڵیٚ ئەی باوەشی گەرم
مەستی نازت کە منی دێوانە
منیش پیٚی ئەلێم ئەی نائاشنا
دەستم لـیٚ بەردە بە من بێگانە

*******

## دواتـــــر

مەرگـــــی من ڕۆژێ ئەگاتە سەرم
بەهارێکی ڕوون بەشەپۆلی نوور
یا زستانێکی دوور و تەمـــــــــاوی
یا پایز خاڵی لە هــــــاوار و شور

مەرگی من ڕۆژێ ئەگاتە سـەرم
یەکـــــــێ لەم ڕۆژە شیرن و تاڵانە
ڕۆژێکی پووچ وەک ڕۆژانی ترم
یەکـــــــێ لەم ئیمڕۆ یا دوێنــێ یانە

چاوەکانم وەک داڵانــی تاریک
سەرگۆناکانم وەک مەڕمەری سەرد
لەپڕ خەوێ ئەمرفێنێ و ئەمـن
خاڵی ئەبمەوە لە هــــــاوار و دەرد

دەستەکانم بێبەش لە سیحری شیعر
سست ئەبن بەســـــەر لاپەڕەکانا
دێتەوە یادم خوێنی هــــــــــــۆنراوە
ڕۆژێ ئەجۆشا هەر لەو دەستانا

پەیتا پەیتا خاك گازم لیَ ئەكا
دێنە پێش تەسلیمی خاكم بكەن
ئاخ رەنگە دڵدارانم نیوە شەو
گوڵباران گۆڕی نمناكم بكەن

پەردە لێڵەكـــــانی جیهانی من
لەدوای خۆم یەكسەر بەلادا ئەچن
چاوی نەناسێك ئەڕوانێتە ناو
كاغەزەكان و دەفتەرگەلــــــی من

پـــــیَ ئەنێتە ناو ژووری بچكۆلەم
بە یادی منەوە بێگـــانەیەك
لە بەر ئاوێنا بەجیَ دەمێنیَ
موویەك ، شوێن پەنجە یاخود شانەیەك

رزگارم ئەبیَ لە خود و بۆ خۆم
هەرچییەك ماوە پاك وێران ئەبیَ
گیانم هەروەكوو چارۆكەی كەشتی
لە ئاسۆدا دوور دوور پەنهان ئەبیَ

رۆژان و هەفتە و مانگان بە پەلە
بە بیَ راوەستان بە دوای یەكدا دێن
چاوەكانی تۆش بە هیوای نامە

لە ڕێگاکاندا هەردەم چاوەڕێن

بەلإم خۆ ئیتر جەستەی ساردی من
لە ژێر گـــــوشاری خاکا نامێنێ
دوور لە لێدانی دڵی تۆ دڵم
بێ تۆ لەوێ خاک دای ئەرزێنێ

دواتر باو باران ورد لەرووی کێل
ئەشۆنەوە ناوم بە یەکجاری
گۆرەکەم بێ نـــــــــــاو ئەمێنێتەوە
دوور لە ئەفسانەی نەنگ و ناوداری

*******

کۆمەڵە هۆنراوەی یاخی بوون

## شیعری سەفەر

بە دڵم کەسێ ئەیوت  هەموو شەو
چەند پەرێشانی  لە دیداری ئەو
لە گەڵ ئەستێرە سپی یەکانا
بەیانی ئەڕوا ، ئەروا بە دووعا

من بە بۆنی تۆ  بێهۆش  لە دنیا
بێ خەبەر لە فێڵ و داوی  سبەی
چاوەکانی تۆ  وەکوو گەردی  زێر
بەسەر موژەی  ناسکما  ئەرژا
جەستەم  لە لەمسی دەستانی  تۆ  داغ
لەبەر هەناسەم  پرچت ئەهەژا
ئەپشکوتم  لە ئەوینا و ئەمگوت
"هەرکەسێ دڵی  دایە دڵداری
بیر ناکاتەوە  لە ئازار دانی
گەر  رۆی چاوی من  چاوەروانی بێ
گەر رۆی عەشقی من  پاسەوانی بێ"

ئاخ ، ئێستا ئەتۆ  رۆشتووی و غرووب
باڵی سێبەری  داوێتە رێگام
خودای  تاریکی  غەم  وردە وردە
پێ ئەنێتە ناو  پەرستگای  نیگام

دەنووسێ لەسەر دیوارەکانی

نیشانەگەلی رەشی قەترانی

*********

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## غەزەل

بۆ چیرۆکی دڵم هەر شەو گوێ هەڵ ئەخـــەی
بۆ بەیانیم وەك چیرۆك فەرامۆش ئەکەی
"سایە"

هەروەکوو بەرد گوێ بۆ دەنگی من هەڵ ئەخەی
بەردی، بێ ئەوەی ببیەی فەرامۆش ئەکەی
ڕێژنەی تازە بەهاریت و لە دەلاقە
بەزەربەی وەسوەسە خەو لـێ ی ناخۆش ئەکەی
دەستی من کە لاسکی سەوزی ڕامووسانە
لەتەك گەڵای مردووا هاو باوەش ئەکەی
لە گیانی مەی گومڕاتری و چاوەکانم
لە ناو کڵپەی ئاگر دەنێی ، مەدهۆش ئەکەی
ئەی مانگی زێڕینی زۆنگاوی خوێنی من
مەستیت خۆش بێ کە بەو جۆرە من نۆش ئەکەی
تۆ چۆمی وەنەوشەیی غرووبی کەوا
دەست لە سەر سینگی ڕۆژ دەنێ و خامۆش ئەکەی
"فروغ"ی تۆ دای لە "سایە" و ڕەنگی نەهێشت
بۆ بە سێبەر ئەویش وا سیاپۆش ئەکەی

******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## ئەو رۆژانە

ئەو رۆژانە تێ پەڕین، گشت
رۆژانی خۆش
رۆژانی تەندروست و پڕ
ئاسمانانی پڕ پوولەکە
ئەو لقانەی پر لە گێلاس
ئەو خانووانەی لە ناو بەرگی پیچك پاڵیان داوەتە یەك
ئەو سەربانانەی کۆلارە بزیۆەکان
ئەو کۆڵانانەی بە عەتری ئەقاقی وڕ

ئەو رۆژانە گشت تێ پەڕین
ئەو رۆژانەی لە درزی پێڵووەکانمەوە
ئاوەزەکانم وەك بڵقی پر لە هەوا ئەخرۆشان
چاوم بەسەر هەر شتێکا بخزایە
وەك شیری تازە ئەینۆشی
دەتوت لەناو بیلبیلەما
کەروێشکی بێئۆقرەی شادی ئامادەیە و
بەربەیانان لەگەڵ خۆرەتاوی پیرا
بۆ گەرانی پێدەشتانی نەناس دەچێ
شەوانەش لە دارستانی تاریکی یا بزر دەبێ

ئەو رۆژانە گشت تێ پەرین

ئەو رۆژانەی بەفری و خامۆش

کەلە پشت پەنجەرەوە لە ژووری گەرما

هەردەم لەدەرێم دەنواری

بەفری پاکی من لەشێوەی خوری نەرما

ئارام ئارامێ دەباری

بەسەر پەیژەی داری کۆنا

بەسەر پرچی پیرە سنەوبەرەکانا و

من لە بیری سبەیدا بووم

سبەی ..

حەجمی سپی ی خلیسك

بەخشەخشی عەباکەی داپیرە دەستی پێ دەکرد

بەدەرکەوتنی تارمایی تاریکی ئەو لەناو دەرگا

-کەلەپڕا خۆی تەسلیمی هەستی ساردی نوور دەکردو-

وە تارمایی سەرگەردانی هەلفڕینی کۆترەکان

لەشووشە رەنگینەکانی پەنجەرەدا

سبەی..

گەرمای کورسی خەولـێ خەربوو

من بێپەروا بەخێرایی

خەت خەتێنی ناو مەشقە کۆنەکانی خۆم

بەدزی چاوی دایەوە

دەسڕیەوە

کە بەفرەکە خۆشی دەکرد

من دەگەڕام بەناو باخچەکەدا خەمناک
لەپەنا گوڵدانی یاسە وشکەکانا
چۆلەکە مردووەکانم دەنایە خاک

ئەو رۆژانە گشت تێ پەڕین
ئەو رۆژانەی سەرسامی و کەیف
ئەو رۆژانەی بێداری و خەو
ئەو رۆژانە هەر سێبەرێ رازێکی بوو
هەر سندووقێکی داخراو کەنزێکی تیا پەنهانی بوو
هەر کونجێکی سندووقخانە لە بێدەنگی نیوەرۆدا
بۆ خۆی وەکوو جیهانێ بوو
لە تاریکی کێ بێباک بوو،
لەلای من قارەمانێ بوو

ئەو رۆژانە تێ پەرین.. ئەو
رۆژانەی جەژن
چاوەروانی هەتاوو گوڵ
ئەو مووچڕکەیانەی عەتر
لەکۆری خامۆش و سادەی نێرگزگەلی سەحراییا
کە لە ئاخرین بەیانیی زستانییا
دیدەنی یان بۆ شار دەکرد
لەگەڵ گۆرانیی دەستگێڕان لە شەقامە درێژەکانی پەڵەی سەوزا
بازار نوقمی بۆنی وێڵ بوو
بونی توندی قاوە و ماسی

بازار لەژێر پێ یەکانا پان دەبۆوە، درێژ دەبوو، تێکەڵ هەموو ساتەکانی رێگا دەبوو

دەسووراوە لەناو چاوی بووکەکانا

بازار دایک بوو بەپەلە بەرەو حەجمە رەنگاورەنگە جووڵاوەکان بەرێوە بوو

دەگەڕاوە

بەزەمیلەی پر پاکەتی دیارییەوە

بازار باران بوو دەباری، دەهاتە خوار، دەهاتە خوار

ئەو رۆژانە تێ پەڕین گشت

ئەو رۆژانەی سەرسامی لە نهێنی یەکانی جەستەدا

ئەو رۆژانەی بەترسەوە ئاشنا بوون لە گەڵ جوانیی دەمارە شین رەنگەکانا

دەستێ کە بە گوڵێکەوە

لە پشت دیوارەوە گازی

لە دەستێکی تر دەکرد و

پەڵەی بچووکی مەرەکەب بەم دەستەوە: وڕو لەرزۆك، ترس لـێ نیشتوو

وە ئەوین بوو

کە لەهەواڵ پرسی یەکی شەرماویدا خۆی جاڕ دەدا

نیوەڕوانی گەرم و بۆقن

لەتەپوتۆزی کۆڵانا عیشقمان دەچڕی

لەزمانی سادەی گوڵە پەپوولە تێ دەگەیشتین

ئێمە دڵمان دەبردە ناو باخی میهرەبانییە بێ گوناهەکان

بەدرەختانمان قەرز دەدا

بەپەیامی ماچەوە تۆپ لەبەینمانا ئەم دەستەو ئەو دەستی دەکرد

بەلـێ عیشق بوو ئەو هەستە نادیارەی کە بەتاریکی

لە ناکاوا

دەوری دەداین

ڕای دەکێشاین، لەگەرمەی ترپەو هەناسەو زەردەخەنەی شاراوەدا

ئەو رۆژانە گشت تێ پەرین

ئەو رۆژانەی وەکوو چۆن گیا لەبەر هەتاوا سیس دەبێ

لەبەر گەرمای هەتاو ڕزین

ئەو کۆلانانەی بە عەتری ئەقاقی وڕ

ون بوون لە ناو

قەرەباڵغیی پڕ لەهەرای شەقامی بێ گەڕانەوا

ئەو کیژەش کە گۆناکانی

بەپەڕەی گوڵی شەمدانی ڕەنگین دەکرد

ئێستا ژنێکی تەنیایە

ئێستا ژنێکی تەنیایە

********

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## لەدایک بوونێکی تر

گشت بوونی من نیشانەیەکی تاریکە
کە لە خۆیا پەیتا پەیتا ئەتۆ بەرەو
بەرەبەیانی شکۆفەو ڕووانی ئەبەدی دەبا
لەو نیشانەیەدا من تۆم ئاخ هەڵکێشا
لەو نیشانەیەدا ئەمن
تۆم بە ئاوو درەخت و ئاگر پەیوەند دا

ژیان ڕەنگە
شەقامێکی درێژ بێ کە هەموو رۆژێ
ژنێکی زەمبیل بەدەست پیا تێ دەپەرێ
ژیان رەنگە
گوریسێ بێ کە پیاوێ خۆی بە دارێکا پێ هەڵواسێ
ژیان رەنگە
منالێ بێ لە قوتابخانە وەگەرێ

ژیان رەنگە داگیرسانی سیغارێ بێ
لە ماوەی تەڕی نێوانی دوو جووت بوونا
نیگای گێژی رێبوارێ بێ
کە کڵاوەکەی لائەباو
بەزەردەیەکی بێ مانا بە رێبوارێکی تر ئەڵێ" بەیانی باش"
ژیان رەنگە ئەو ساتە داخراوە بێ

کە نیگای من لە سۆمای چاوانی تۆدا وێران دەبێ
بەو هەستەوە
کە من تێکەڵاوی ئەکەم لە تەکی بینینی مانگ و سەرهەڵدانی تاریکییا

لە ژوورێکا کە ئەوەندەی تەنیایی یە
دڵی ئەمن
کە ئەوەندەی یەک ئەوینە
بۆ بەهانە سادەکانی بەختیاریی خۆی ئەروانێ
بۆ زەوالی جوانی گوڵەکان لە گوڵدان
بۆ ئەو نەمامەی لە باخچەی ماڵەوەمان تۆ ناشتووتە
بۆ ئاوازی کەنارییەکان
کە بە پڕی پەنجەرەیەک دەچریکێنن

ئاخ.. هەر ئەمەیە بەشی من
بەشی ئەمن هەر ئەمەیە

بەشی ئەمن
ئاسمانێکە کە هەڵواسینی پەردەیەک لێمی ئەگرێ
بەشی ئەمن دابەزینە لە یەک قادرمەی چۆڵ کراو
وە تا گەیشتن بە شتێک لە داڕزاوی و غوربەتا
بەشی ئەمن گەڕانێکی خەماوی یە بە باخی یادگارەکاناو
مردن لە تاسەی دەنگێکا کە پێم دەڵێ:
"خۆشم دەوێن

دەستەكانت"

دەستەكانم لە باخچەكەدا دەنێژم
سەوز ئەبم باش ئەزانم، باش ئەزانم، باش ئەزانم
وە لە ناو پەنجە مەرەكەباویەكانما
پلیسرکەکان هێلكە دەكەن

دوو گێلاسی سووری چەسپاو
وەك گوارە
بە گوێكانما هەڵ دەواسم
نینۆكەكانم بە پەڕەی گوڵی كەوكەب دادەپۆشم
كۆڵانێك هەیە كە لەوێ
ئەو كوڕانەی عاشقم بوون
ئێستاش هەر بەو مووی لاوازو قاچی لەڕو ملی باریكەیانەوە
لەخەیاڵی زەردەخەنەی بێ مەبەستی كچۆڵەیەكدان كە شەوێ
با لە تەكی خۆیا بردی
كۆڵانێك هەیە دڵی من
لەو گەڕەكانەی سەردەمی مناڵی خۆمی دزیوە

گەشتی حەجمێك بەسەر هێڵی زەماناو بە..
حەجمێ هێڵی وشكی زەمان ئاوس كردن
حەجمی وێنەیەكی وشیار
كە لە دێنیی ئاوێنەیەك دێتەوانێ

وە بەم جۆرەیە كە كەسێ

دەمرێ و كەسێ

بەقای دەبێ

لە جۆگەیەكی بچووكا كە دەرژێتە ناو چالاوێ

هیچ ڕاوچی یەك

مرواری ناخاتە داوێ

پەرییەكی بچكۆلەی خەمگین دەناسم

لە ئۆقیانووس جێگیر بووە

ئارام ئارام

لە شمشالێكی دارینا دڵی دەچرێ

پەرییەكی بچكۆلەی خەمبار

كە بەیەك ماچ شەوان دەمرێ و

بەرەبەیانیش بە یەك ماچ دێتە دنیا

*******

كۆمەڵە هۆنراوەی لەدایكبوونێكی تر

## لەسەر زەوی

هەرگیز ئارەزووم ئەوە نەبووە
ئەستێرەی سەرابی ئاسمان بم
یا وەکوو گیانی هەڵبژاردەکان
هاودەمی کچی فریشتەکان بم
هەرگیز لەزەوی من جودا نەبووم
لەگەڵ ئەستێرە ئاشنا نەبووم

من لەسەر زەوی ڕێک ڕاوەستاوم
بەجەستەمەوە کە وەک لاسکی گیا
هەڵ دەمژێ ئاوو هەتاو و هەوا
بۆ ئەوەی بژی

پر لە ئارەزوو
پر لە ئێش و ژان
ڕاوەستاوم لەسەر رووی ئەم خاکە
تا ئەستێرەکان ستایشم کەن
تا ئەستێرەکان نەوازشم کەن

لە دەلاقەکەمەوە دەڕوانم
دەنگدانەوەی یەک گۆرانیم و بەس

نەمر نیم ئەمن

لە دووی سەدای یەک ستران ئەگەڕێم

لە ناڵەی لەززەتێکا کە پاکتر

لە بێدەنگیی ساکاری غەمێکە

لەدووی هێلانە ناگەڕێم ئەمن

لە جەستەیەکا کە ئاونگێکە

بەسەر زەنبەقی جەستەی خۆمەوە

لەسەر دیواری ژوورم کە ژینە

کەسانی ڕێبوار

نووسیویانە بە خەتی ڕەشی عیشق

چەندین یادگار

دڵی تیر خواردوو

مۆمی سەرەو خوار

چەند خاڵی کپی ڕەنگ پەریو بەسەر

پیتە تێکەڵەکانی شێتی یا

هەر لێوێ بەسەر لێومدا چەسپا

تۆوی یەک ئەستێرەی پرژانە ناو

شەوم کەبەسەر رووباری یادا باڵی دەکێشا

ئیتر بۆ مەیلی ئەستێرە بکەم؟

ئەمەیە گۆرانیم

دڵگیر و دڵخواز

پێش ئێستاش لەمە زیاتر نەبووە

## ڕۆژ دەبێتەوە

بڕوانە چۆن خەم لەناو دیدەما
قەترە بەقەترە چۆن دەبێ بەئاو
چۆن چۆن سێبەری ڕەشی سەرکەشم
ئەبێ بە ئەسیری دەستی هەتاو
بڕوانە کەوا
هەموو وجوودم چۆن دەبێ خراو
پریشکێک بە ناخیا دەمباتە خوار
دەمباتە لووتکە
جا دەمخاتە داو
بڕوانە هەموو ئاسمانی من
چۆن پڕ ئەبێ لە ئەستێرەی کشاو

تۆ هاتی لە دوور
لە دووری لە دوور
لە سەرزەمینی بۆنی خۆش و نوور
منت خستە ناو
بەلەمێک لە عاج و هەورو بلوور
ئێستاش ئەی هیوای دڵنەوازی من
بمبە بۆ شاری شیعر و شەوق و شوور

ئەڕۆین بۆ ڕێگای پر لە ئەستێرە

ئەسەکنێین لەولا تری  ئەستێرە

بڕوانە

من بە ئەستێرە سووتام

لێوان لێو پڕ لە ئەستێرەی گەرمیم

هەرچی  ئەستێرەی  گۆماوی  شەوە

وەک ماسی سووری سادە دڵ چنیم

ئەم خاکەی ئێمە پێشتر چەند دوور بوو

لەم ژووره شینانەی ئاسمانەوە

ئێستا دووبارە دێتە گوێم دەنگت

دەنگی  باڵی بەفرینی  فریشتە

بڕوانە ئەمن

تا کوێ گەیشتووم

هەتا ئاسمان، تا هەمیشەیی

هەتا بێ پایان

ئێستا کە هاتووینە لووتکەی ژیان

بمشۆ بە شەرابی ئەستێرەکان

بمپێچە بە ئاوریشمی  ماچی خۆت

بمخوازە شەوانی درێژخایان

جێم مەهێڵە دی

جودام مەکەوە لە ئەستێرەکان

چۆن قەترە قەترە دەتاوێتەوە

بڕوانە لەگەڵمانا مۆمی شەو

سووراحی رەشی چاوەکانی من

بەلایەلایەی  گەرمی گەرمی تۆ

لێوان لێوە دەبێ لە شەرابی خەو

بڕوانە بەسەر بێشکەی شیعرما

چۆن تۆ هەڵ دێیت و رۆژ دەبێتەوە

*******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## باوەر بێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما

ئەمە منم
ژنێ تەنیا
لەسەرەتای  وەرزی سەرما
لە ئەوەڵی پەی بردن بە بوونی ئالوودەی زەميناو
نائومێدی سادەو خەمناکی ئاسمانا و
بێ تینی ئەم دەستە چیمەنتۆیی یانا

زەمان رۆیی
زەمان رۆیی و کاتژمێر چوار زەنگی لێ دا
چوار کەرەتان
ئەمرۆ رۆژی یەکی (دەی)ە
رازی وەرزەکان دەزانم
قسەی ساتەکان تێ دەگەم
رزگارکەر وا لەناو گۆڕیدا نووستووە
خاکیش کە وەرمان دەگرێ
ئیشارەتە بە خامۆشی

زەمان رۆیی و کاتژمێر چوار زەنگی لـێ دا

کۆڵان  بایە
کۆڵان  بایە و

من لە بیری  جووت گرتنی گوڵەکانا و
ئەو خونچانەی لاسکیان سیس و کەم خوێنەو
ئەم زەمانە کەنەفت و سیلاوی یەدام
پیاوێ بەلای درەختانی  تەڕدا دەروا
پیاوێ کە ڕستەی دەمارە شینەکانی
وەکوو ماری  مردوو  بە هەردوو لاملیا هەڵگەراون
لە پەناگوێی پەشێویدا ئەو نەغمە خوێناوی یانە دەڵێتەوە
-سڵاو
-سڵاو
وە من لە بیر جووت گرتنی گوڵەکانام

لەسەرەتای وەرزی سەرما
لە کۆڕی ماتەمینی ئاوێنەکانا
لە کۆبوونەوەی خەمباری  ئەزموونە کەم ڕەنگەکانا
لەم غروبە بە زانستی بێ دەنگی یە ئاوسەدا
مەگەر دەکرێ
بەو کەسەی بەم جۆرە دەروا
بە تەحەممول،
بە سەنگینی،
وا سەرگەردان،
دەستووری  ڕاوەستان بدرێ؟
مەگەر دەکرێ پێی بوترێ تۆ زیندوو نیت، تۆ هیچ کاتێ
زیندوو نەبووی؟

کۆڵان بایە
قەلەرەشانی تەنیایی و تەکینەوە
بە باخی پیری بێتینیدا دەگەرێن
وە پەیژەش
بەرز ییەکەی چەند بێ مانایە!

ئەوان هەموو ساویلکەیی یەک دڵێکیان
لەگەڵ خۆیان بۆ کۆشکی  چیرۆک بردەوە
ئیتر چلۆن
چۆن کەس هەڵ دەستێ بۆ سەماو
پرچی منداڵی لە ئاوی ڕەوانا شۆر دەکاتەوە!
وە ئەو سێوەی کە ڕنیویە و بۆی کردووە
لەژێر پێیا مەگەر چۆن پان دەکاتەوە!

ئەی یار ، ئەی تاقانەترین
چ گەواڵەی رەش چاوەرێی رۆژی میوانیی هەتاون
وەکوو بڵێی لەسەرە رێی بەرجەستە بوونی فڕین بوو
کە لەناکاو ئەو باڵندەیە پەیدا بوو
وەکوو بڵێی لە خەتی سەوزی  خەیاڵ بوون
ئەو گەڵا تازانەی لەبەر شەهوەتی نەسیما هەناسە سواربوون
وەکوو بڵێی
ئەو گڕە وەنەوشەیییەی لە مێشکی پاکی پەنجەرەدا دەسووتا
شتێ نەبوو تەسەووریکی پاکژی  چرا نەبێ

کۆڵان بایە
واسەرەتای  وێران بوونە
ئەو رۆژەش کە دەستەکانی تۆ وێران بوون هەر بای هەبوو
ئەی ئەستێرە شیرینەکان
هۆ ئەستێرە کارتۆنییە شیرینەکان
کاتێ کەوا درۆ لە ئاسمان هەڵ دەکا
چۆن دەکرێ پەنا بۆ سوورەتەکانی نێرراوانی بەزیو ببەین

ئێمە وەکوو مردووانی هەزاران ساڵ پێك دەگەین و
هەتاو بەسەر بێ هودەیی جەستەمانا بڕیار دەدا

من سەرمامە
من سەرمامە و ئەلـێی هەرگیز گەرم نابمەوە
ئەی یار، ئەی تاقانە ترین!" ئەو شەرابە چەند ساڵە بوو؟"
تەماشاکە وا لێرەدا
زەمان چەندە وەزنی هەیە!
ماسی یەکان چۆن گۆشتی ئێمە دەکرۆژن!
بۆ بەردەوام لە بنی دەریا رام دەگری؟

من سەرمامە و لە گوارەی سەدەف بێزار
من سەرماشمە و دەشزانم
کە لەهەرچی وەهمی سووری گولاڵەیەکی کێوییە
بێجگە لە چەند دڵۆپە خوێن
شتێکی تر جێ نامێنێ

واز لە هێڵەکان دەهێنم
واز لە ژماردن دە هێنم
لەناو شێوە ئەندازەیی یە دیارەکاندا
پەنا لە بۆ دەشتی بەرینی شعوور دەبەم
من ڕووتم ، رووتم، من رووتم
وەکوو بێ دەنگی نێوانی گفتوگۆی عەشق من رووتم
زامەکانم هەر هەموویان هی ئەوینن
من ئەم دوورگە سەرگەردانەم
لەناو تۆفی ئۆقیانووس و گڕکانی کیۆ دەرکردووە
پارچە پارچە بوون نهێنی ئەو وجوودە یەکپارچە بوو
کە هەتاو لە بێ نرخترین گەردەکانی هاتە دنیا

سڵاو ئەی شەوی بێ گوناه
سڵاو ئەی ئەو شەوەی کەچاوی گورگانی بیایانی
دەکەی بە چاڵی ئیسقانی ئیمان و باوەڕ بەخۆیی
لەگوێ جۆگەکانی تۆدا ، گیانی درەختەکانی بی
بۆنی گیانی میهرەبانی تەور دەکەن
من لە دنیای گوێ نەدانی بیرو قسەو دەنگەوە دێم
ئەو دنیایەی وەکوو لانەی ماران وایە
ئەو دنیایەی پڕ لە دەنگی جووڵەی پێی مەردومانێکە
کە ئەو کاتەی ماچت دەکەن
لەبیریانا پەتی سێدارەت بۆ دەچنن
سڵاو ئەی شەوی بێ گوناه

نێوانی پەنجەرەو بینین
هەمیشە مەودایەک هەیە
بۆ نەم ڕوانی؟
وەک ئەوکاتەی  پیاوێ بەلای درەختانی تەڕا دەرۆی
بۆ نەم روانی؟
وەکوو بڵێی دایکم ئەو شەوە گریابێ
ئەو شەوەی من گەشتمە ژان و تۆو  دروست بوو
ئەو شەوەی من بوومە بووکی هێشووەکانی ئەقاقی
ئەو شەوی  ئەسفەهان پڕ لە دەنگدانەوەی کاشیی شین بوو
ئەو کەسەی کە نیوەی من بوو گەرابۆوە ناو تۆوی من
وە من لە ئاوێنا دەمدی
وەک ئاوێنە پاک  وبێ گەرد
لەپرێکا بانگی کردم
منیش بوومە بووکی هێشووی ئەقاقی یەکان

وەکوو بڵێی دایکم ئەو شەوە گریابێ
چ بێ هودە رۆشنایی یەک لەم دەلاقە داخراوە سەری هەڵدا
بۆ نەم روانی

گشت ساتەکانی بەختیاری دەیان زانی
دەستەکانت وێران دەبن
من نەم ڕوانی
هەتاکوو پەنجەرەی سەعات

کرایەوە و ئەو کەنارییە خەمبارە چوار جار لێی دا
چوار جار لێی دا
منیش تووشی ئەو ژنە بچکۆلەیە بووم
کە چاوانی لە هێلانەی بەتاڵی سیمورغ دەچوون
وەك لە جووڵەی ڕانەکانیەوە دەردەکەوت
دەتوت کچێنیی خەیاڵی پر شکۆی منی
لەگەڵ خۆیا بۆ ناو جێگەی شەوی دەبرد

بڵێی دیسان پرچەکانم
لەبەر بادا شانە بکەم
بڵێی دووبارە وەنەوشە لە باخچەکانا بنێژم؟
یا شەمدانی لە ئاسمانی
پشتی پەنجەرە دابنێم؟
بڵێی دیسان بەسەر پیاڵەدا سەماکەم؟
بڵێ ی دیسان زەنگی دەرگا بۆ چاوەروانی دەنگ بمبا؟

بە دایکم گوت "ئیتر تەواو"
وتم" دایم پێش ئەوەی بیر بکەیتەوە لێت دەقەومێ
پێویستە بۆ رۆژنامەکان سەرەخۆشی رەوانەکەین"

مرۆڤی بۆش
مرۆڤی بۆشی پر باوەر
بروانە چۆن دانەکانی
کاتی جوین ئاواز دەڵێن

وە چاویشی

چۆن لە کاتی تێ ڕامانا هەڵ دەدرِن!

بۆخۆشی چۆن بەلای درەختانی تەردا تێ ئەپەڕێ

بە تەحەممول،

بەسەنگینی،

وا سەرگەردان

کاتژمێر چوار

لەساتێکا کە ڕستەی شینی دەماری

وەکوو ماری مردوو بەهەردوو لاملیا هەڵ گەڕاون

لەپەناگوێ ی پەشێویدا ئەو نەغمە خوێناویانە دەلێتەوە

-سڵاو

-سڵاو

ئایا تۆ قەت

ئەو چوار گوڵاڵە شینانەت

بۆن کردووە؟

زەمان رۆیی

زەمان رۆیی و شەویش لەسەرلقی ڕووتی گوڵی ئەقاقیا هەڵ نیشت

شەو لەو دیوی شووشەی پەنجەرەکانەوە هەڵ دەتووزا و

بە زمانی سارد

پاشماوەی رۆژی رابووردووی هەڵ دەلووشی

لە کوێوە دێم؟

لەکوێوە دێم؟

من ئەوەندە تێکەڵاوی بۆنی شەوم

هێشتا خاکی گڵکۆی تەڕە

گڵکۆی ئەو دوو دەستە سەوزە لاوە دەڵێم

تۆ چەند میهرەبان بووی ئەی یار، ئەی تاقانەترین یارم

تۆ چەند میهرەبان بووی کاتێ درۆت دەکرد

چەند میهرەبان بووی کاتی کە پێلووی ئاوێنەت دادەخست

بە لاسکە تەلەکانەوە

چلچراکانت دەچنی

لەشەوێکی زاڵمەوە منت بەرەو لەوەڕگای عیشق دەدایە بەر

هەتاکوو ئەو هەڵمە مەستەی پاش ئاگری تینووێتی

دەکەوتە سەر چیمەنی خەو

ئەو ئەستێرە کارتۆنیانە

بەدەوری بێ کۆتایی دا دەخولانەوە

بۆ چی قسە بەدەنگ کرا؟

بۆچی نیگا لەماڵی چاو میوان کرا؟

بۆ رامووسان

بۆلای شەرمی گێسووی کچێنی برا

بروانە چۆن ئالێرەدا

گیانی ئەوکەسەی کە بە قسە هاتە دوان

وە بە نیگا تەئسیری کرد

بەڕامووسان ئارامی گرت

ئێستاکە بە تیری وەهم

چوار مێخ کرا؟

جێی پێنج لقی پەنجەکانت

کە وەک پێنج وتەی راستی بوون

چۆن لەسەر رووی گۆنای دیارن؟

سکووت چیە؟ چیە؟ چیە؟ ئەی تاقانەترین یارم

سکووت چیە بێجگە لە قسەی نەوتراو

من ناتوانم بدوێم بەلاّم زمانی پاساری یەکان

زمانی ژینی جوملەی تێ پەرینی جەژنی سروشتە

زمانی پاساری یەکان یانی بەهار، گەلاّ، بەهار

زمانی پاساری یەکان یانی نەسیم، عەتر ، نەسیم

زمانی پاساری یەکان لە کارخانەدا وا دەمرێ

ئەمە کێ یە بەسەر جادەی ئەبەدیەتا

بەرەو ساتی تەوحید ئەڕوا

سەعاتە هەمیشەیی یەکەی

بە مەنتیقی ماتماتیکی لێ دەرکردن وجیاوازی قورمیش دەکا

ئەمە کێیە ئەو کەسەی کە خوێندنی کەڵەشێرەکان

بەسەرەتای رۆژ نازانێ

بەسەرەتای بۆنی بەرچایی دەزانێ

ئەمە کێیە ئەو کەسەی کە تاجی عەشقی لەسەر ناوەو

لەناو جلوبەرگی شاییدا گەنیوە

هەتاو کەوابێ سەرەنجام

لەیەک کاتا

شەوقی نادا لە هەردوو قوتبی بێ هیوا

تۆ لە دەنگی کاشی شین خاڵی بوویتەوە

من هێند پڕم لەسەر رووی دەنگم نوێژ دەکەن

جەنازەی شاد

جەنازەی مات

جەنازەی کپی تێ راماو

جەنازەی شیک، جەنازەی خۆش خۆرو رووخۆش

لەوێستگاکانی کاتی دیاریکراوا

لەزەمینەی بەگومانی نووری کاتی و

شەهوەتی کرینی میوەی گەنیوی بێ هودەییا

ئاە،

چ خەڵکانێک لە چوارڕێکاندا نیگەرانی رووداون

لەدەنگی ئەم هۆرنی راوەستانانەش!

لە ساتێکا کە دەبێ، دەبێ ، کە دەبێ

پیاوێ لەژێر چەرخی زەمانا ورد ببێ!

ئەو پیاوەی کە بەلای درەختانی تەڕا تێ ئەپەری!

لە کویوە دێم؟

بە دایکم گوت " ئیتر تەواو"
وتم " هەمیشە پێش ئەوەی بیر کەیتەوە، لێت دەقەومێ
پێویستە بۆ رۆژنامەکان سەرەخۆشی رەوانەکەین"

سلاو ئەی سەیریی تەنیایی
ژوورەکەم بە تۆ دەسپێرم
چونکە هەمیشە هەوری رەش
پەیامبەری ئایەتی تازەی پاکژین
لە شەهیدبوونی هەر مۆمێ
رازێکی رووناك پەنهانە
کە هەڵکشاوترین گڕو دوایەمین گر باش دەیزانێ

باوەڕ بێنین
باوەر بێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما
باوەر بێنین بە وێرانیی باخی خەیاڵ
بە داسی ئاوەژووی بێکار
بە تۆوی دیل
شا! چۆن بەفرێ وا دێتە خوار

حەقیقەت رەنگە ئەو دوو دەستە لاوە بێ
کە کەوتە ژێر بەفری باریوی پەی دەر پەی
ساڵێکی تر، کاتێ بەهار
لەودیوی پەنجەرەکەوە لەگەڵ ئاسمان دا دەخەوێ
لەناو لەشیا

**فوارەی لاسکی سەوزی بەگوڕ**

**سەرهەڵ ئەدەن**

**ئەویش رەنگە چرۆ بکا، ئەی یار ئەی تاقانەترین**

**باوەر بێنین بەسەرەتای وەرزی سەرما...**

*********

**کۆمەڵە هۆنراوەی باوەر بێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما**

## تێپەڕین

تاکەی برۆم
لەشوێنێ بۆ شوێنێکی تر
من ناتوانم، من ناتوانم هەربگەڕێم
هەرتاوە بۆ عیشقێکی تر ، یارێکی تر
بریا دوو باڵندە بووینا
هەموو تەمەن کۆچمان کردبا
لە بەهارێکەوە بۆ بەهارێکی تر

ئاخ لە مێژە
ئەڵێی بەسەرما رووخاوە
داروپەردووی هەورێکی تاریکی سەنگین
کە بە ماچت لەسەر لێوم تێکەڵ دەبم
وا دەزانم
گیان وەکوو عەترێکی کاتی رادەبووڕێ

هێند تێکەڵە
ئەوینی خەمناکم بە ترسی لەناوچوون
هەموو ژیانم دەلەرزێ
کە سەرنجی ئەتۆ دەدەم
ئەڵێی لە پەنجەرەکەوە
تاکە درەختی پڕ گەڵام سەیر دەکەم

لەپەتای زەردی خەزانا
ئەڵێی وێنەیەك سەیرەكەم
لە ناو ئاوی خرۆشاوی جۆگەلەیەكی ڕەوانا

شەو و رۆژ
شەو و رۆژ
شەو و رۆژ
رێم بدە ..
بیرم چێتەوە

تۆ چیت یەك سات نەبێ ، یەك سات كە چاوی من
لە ناو سەحرای هوشیارییا
هەڵی دێنێ
رێم بدە..
بیرم چێتەوە

*******

كۆمەڵە هۆنراوەی لەدایكبوونێكی تر

## ئایەتە زەمینییەکان

ئەو دەمەی کە
هەتاو تینی تێدا نەماو
بەرەکەت لە زەوی بڕا

سەوزایی دەشتان وشک بوون
ماسی دەریاکان وشک بوون
خاک چیتر جەستەی مردووانی وەرنەگرت

شەو لە هەموو پەنجەرە ڕەنگ زەردەکانا
وەک خەیاڵێکی بەگومان
گرد دەبۆوە و جۆشی دەخوارد
ڕێگاکان لە تاریکییا
دەست بەرداری سەری ئەو سەری خۆیان بوون
چیتر کەس بیری لە ئەوین نەکردەوە
هیچ کەس بیری لە سەرکەوتن نەکردەوە
وە هیچ کەسیش
بیری لە هیچ نەکردەوە

لە ئەشکەوتی تەنیاییا
بێ هودەیی هاتە دنیا

خوێن بۆنی بەنگ و ئەفیونی لێوە دەهات
ژنی دووگیان
منداڵی بێ سەریان دەبوو
هەرچی پێشکەشە لە شەرمان
پەنایان برد بۆ گۆڕەکان

چ رۆژگارێکی رەش و تاڵ
نان قودرەتی سەرسوڕهێنەری ئیمانی
وەژێر نابوو
پەیامبەران ڕووت و برسی
شوێن وەعدەی خوا بە جێ هێشتوو
بەرخانی وێڵ
چی تر دەنگی هێ هێی شوانیان
لە سەرسامی دەشتەکانا گوێ لـێ نەبوو

دەتوت لە چاوی ئاوێنا
وێنەکان و ڕەنگ و جووڵە
بە ئاوەژوو دەردەکەون
دەوری سەری گاڵتەجارانی بێ مایەو
دەمووچاوی ناشیرینی سۆزانییەکان
وەکوو چەترێکی داگیرساو
خەرمانەیەکی نوورانی و
پیرۆز شەوقی ئەدایەوە

زۆنگاوەکانی ئەلکهوول
بەو هالاوە بۆگەن و ژەهراوییەیان
دەستەی کرێ رۆشنبیریان
بۆ  ناخی خۆیان  لووش ئەدا
مشکی موزیرٍ
لە سندووقە کۆنەکانا
لاپەڕە زێرینەکانی  کتێبەکانیان دەکرتان

خۆر مردبوو
هەتاو مردبوو، سبەینێش
لە خەیاڵی مندالانا
مانایەکی نادیارو ونی هەبوو
لە مەشقیانا
غەرابەتی ئەم  دەستەواژە کۆنەیان
بەپەڵەی رەشی درشت وێنە دەکێشا

خەڵکی
خەڵکی ناکام
دڵ مردوو، تەریک و سەرسام
لەژێر باری شوومی بەدەنی خۆیانا
لە غوربەتیّ بۆ غوربەتێکی تر دەچوون
حەزی ئازاراویی تاوان
هەڵ دەئاوسا لە دەستیانا

جار جار تروسکەیەک، تروسکەیەکی کز
ئەم کۆمەڵە کپە بێ گیانەی لەناکاو
لەناوەوە هەڵ دەتەکان
پەلاماری یەکیان دەدا
پیاوان بە کێرد
گەرووی یەکتریان دەدڕان
لەپێخەفی خوێناوییا
هاوئامێزی
کیژانی نابالْق ئەبوون

نوقمی ترسی خۆیان بوون و
هەستی تۆقێنەری گوناه
گیانی گێژو کوێریانی لە کار خستبوو
لە مەراسیمی ئیعداما
کاتێ گوریس
چاوی کرژی مەحکوومێکی
بە گوڕ لە کاسە دەردێنا
ئەوان دەچوون بە تاسەوەو
مێشکی پیر و کەنەفتیشیان
بە خەیاڵێکی خۆشەوە
ژان دەیهاتێ
کەچی هەردەم لە گۆشەی مەیدانەکانا
ئەتبینی ئەم تاوانبارە بچووکانە
ڕاوەستاون

لە پرژانی بەردەوامی فوارەی ئاو

تیَ ڕاماون

دەڵێی ئێستاش

لە پشت چاوە پان بۆوەکان، لە ناو قوڵایی سربوونا

شتێکی لێڵ و نیوە گیان

هێشتا ماوە

بە هەوڵی بێ تین دەیەوێ

باوەر بێنێ بە پاکژیی گۆرانیی ئاو

رەنگە بەڵام چ خەیاڵێکی بێ پایان

خۆر مردبوو

کەس نەیدەزانی " باوەڕ" بوو

ناوی ئەو کۆترە خەمبارەی

کە لە دلان تەرە ببوو

ئاخ ئەی دەنگەکەی زیندانی

بڵێی شکۆی نائومێدیت قەت بتوانێ

لە لایەکی ئەم شەوە قێزەونەوە

بکاتەوە بەرەو رووناکی دالانێ!

ئاخ ئەی دەنگەکەی زیندانی

ئەی دوایین دەنگی دەنگەکان

******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## با ئەمانبا

ئەفسووس لە شەوی بچووکی منا
با لەگەڵ گەڵای درەختەکانا ژوانی گرتووە
لەشەوی گچکەی منا دڵە راوکێی وێرانی یە

گوێ بگرە گڤەی
بای تاریکایی نایەتە بەرگوێت؟
نامۆیانە من ئەڕوانمە ئەم بەختیارییە
راهاتووم لەگەڵ نائومێدی خۆم

گوێ بگرە گڤەی
بای تاریکایی نایەتە بەرگوێت؟
ئێستا لەشەوا شتێ روو ئەدا
مانگەکەی سەرسەخت و حاڵ پەرێشان
لەسەر ئەم بانە
کەهەر سات تێیدا ترسی ڕووخانە
هەور وەك کۆمەڵی پرسەداران
دەڵـێی چاوەرێی دەمی بارانە

ساتێکە و جا هیچ
شەو لەودیو ئەم پەنجەرە دەلەرزێ
سووڕانی زەوی

وادێتە وەستان

ئەی سەرتاپات سەوز

دەستەکانت وەک یادێکی بەجۆش

بنێرە ناو دەستی عاشقی من

لێوەکانیشت وەک هەستێکی پڕ لە گەرمای وجوود

بە ڕامووسانی لێوی عاشقی ئەمن بسپێرە

با لەگەڵ خۆیا ڕامان ئەپێچێ

با لەگەڵ خۆیا ڕامان ئەپێچێ

********

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## تەنیا  دەنگە كە دەمێنێ

بۆ  ڕاوەستم؟

باڵندەكان  بۆسۆراخی  كەنارێكی  ئاوی ڕۆشتوون

ئاسۆ شاقووڵ،

ئاسۆ شاقووڵییەو جووڵەش وەك  فووارە

تا چاو بڕكا

هەسارەی  ڕووناك  دەچەرخێن

زەوی لەبەرزی دووبارە دەبێتەوە

چاڵی هەواش

دەبنە تونێلی پەیوەندی

وە ڕۆژیش پانتایی یەكە

لەخەیاڵی تەنگی ڕۆژنامەدا جێگەی نابێتەوە

بۆ ڕاوەستم؟

ڕێگە بەناو مووڕەگەكانی ژیانا تێ دەپەڕێ

دۆخی ژینگەی پاپۆڕی منداڵدانی مانگ

خانە خراپەكان دەكوژێ

وە لەهەوای كیمیایی پاش خۆركەوتنا

تەنیا دەنگە

كە تێكەڵی گەردەكانی زەمان دەبێ

بۆ ڕاوەستم؟

زۆنگاو مەر دەتوانێ چی بێ؟

دەتوانێ چی بێ بەغەیری جێگەی گەرای مێرووی فەساد

جەنازەی ئاوساو دەزانێ خەیاڵی مەیتخانە چییە

لەناو تاریکییا نامەرد

ناپیاویی خۆی شاردۆتەوە

سیسرکیش ئاه !

کاتێ کە سیسرک دەدوێ

بۆ ڕاوەستم؟

بێهودەیە هاوکاری پیتی قورقوشمی

هاوکاریی پیتی قورقوشمی ئەندێشەی پووچ قوتار ناکا

من لە نەوەی درەختانم

هەڵمژینی هەوای ماوە پەستم دەکا

باڵندەیەک کەمردبوو فێری کردم فڕینم لەیاد بمێنێ

کۆتایی هەموو هێزەکان یەکگرتنە، یەکگرتنە

لەگەڵ بنچینەی ڕۆشنی خۆرەتاوا و

ڕژانە ناو شعووری نوور

سروشتییە

کە ئاشە هەوایی یەکان ژەنگ هەڵ بێنن

بۆ ڕاوەستم؟

من گوڵە گەنمی نەگەیو

لەسەر مەمکم دادەنێم و

شیری دەدەم

دەنگ و دەنگ و بەتەنیا دەنگ

دەنگی رۆشنیی تکای ئاو بۆ رێ کردن
دەنگی پرژانی رووناکی ئەستێرەکان
بەسەر دیواری مییێنەیی زەمینا
دەنگی یەکگرتنی تۆوی ..
مەعناو هەڵکشانی زیهنی هاوبەشی عیشق
دەنگ ، دەنگ، دەنگ، تەنیا دەنگە کە ئەمێنێ

لە ولاّتی کورتیلەکان
پێوانەکانی هەڵسەنگاندن
هەردەم لەسەر خولگەی سفر سەفەر دەکەن
بۆ ڕاوەستم؟
من مل کەچی چوار توخمەکەم
کاری نوسینەوەی پەیڕەونامەی دڵم
کاری حوکمەتی ناوچەیی کوێران نیە

من چیم داوە بە لوورەی وەحشییانەوە
لە ئەندامی جنسیی ئاژەڵدا
من چیم داوە بە جووڵەی بێ مانای کرمێکەوە لە بۆشایی گۆشتا
هاوپشتیی گوڵ منی لەگەڵ ژینا هاوپەیمان کردووە
هاوپشتیی گوڵ خۆ ئەزانی؟

*****

کۆمەڵە هۆنراوەی باوەربێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما

## وەهمی سەوز

تەواوی رۆژ لە ئاوێنەدا دەگریام
بەهاریش پەنجەرەكەمی
بە وەهمی سەوزی درەختان سپاردبوو
جەستەم لە قۆزاخەی تەنیاییمدا جێگەی نەدەبۆوە
بۆنی تاجە كاغەزییەكەم
هەوای ئەو ناوچە بێ خۆرەی
پیس كردبوو
نەم دەتوانی، نەم دەتوانی
چیتر دەنگی كۆڵان ، دەنگی باڵندەكان
دەنگی بزربوونی تۆپەكانی تێنس
هاوارهاواری منداڵانی ڕاكردوو
سەمای میزەڵدانەكانیش،
كە وەك بڵقی كەفی سابوون
لە كۆتایی لاسكێكی دەزووەوە هەڵ دەكشان
باش كە دەتوت
لە ناخی قووڵترین ساتە تەڵخەكانی جووتبوونەوە ناڵەی دەهات
گشت گوشاریان
بۆ حەساری قەڵای كپی ئیعتیمادی من دەهێناو
لە درزە كۆنەكانەوە دڵمیان بەناو بانگ دەكرد

بەدرێژایی رۆژ نیگای من

ڕامابوو لە چاوەکانی ژیانی خۆم
لەو دوو چاوە پەرێشان و ترساوانە
کە خۆیان لە نیگای توندی من لائەداو
وەک درۆزن
پەنایان بۆ گۆشەگیریی بێ خەتەری پێڵوو دەبرد

کام لوتکەیە؟ کام بەرزایی ؟
مەگەر هەموو ئەم ڕێگە پێچاو پێچانە
لەو دەمە ساردە مژەرا
پێک ناگەن و تەواو نابن؟
چیتان پێ دام ئەی وشە ساکارەکانی هەڵخەڵەتان؟
ئەی ڕیازەتی ئەندام و خواستەکانم؟
ئەگەر گوڵێکم لە پرچی خۆم بدایە
لەم فرو فێڵە، لەم تاجە کاغەزییە
کەلەسەر سەرم گەنیوە،
سەرنج ڕاکێش تر نەدەبوو؟

نازانم چۆن گیانی بیابان دایگرتم
یا سیحری مانگ لە باوەڕی کۆمەڵ دووری خستمەوە!
دڵم چۆن بە نیوە ناچڵی گەورە بوو
وە هیچ نیوەیەک ئەو نیوەی تەواو نەکرد!
چۆن ڕاوەستام و چۆن بینیم
خاک لەژێر پێما ڕۆ دەچێو
گەرمایی جەستەی هاوجووتم

پەی بە چاوەروانی پووچی جەستەم نابا!

کام لوتکەیە کام بەرزایی؟
ئەی فانووسە کزۆڵەکان پەنام بدەن
ئەی خانوو ڕووناکە بەگومانەکان
کە پۆشاکی شۆراو لە ئامێزی دووکەڵی بۆندارا
لەسەر بانی بەرهەتاوتان شەکاوەیە!

پەنام بدەن ئەی ژنانی سادەی کامڵ
کە پەنجە ناسکۆڵەکانتان لەو دیوی پێست
ڕەوتی جووڵەی شادی بەخشی کۆرپەلەیەك
دەپشکنێ!
هەواش هەردەم لە درزی یەخەتانەوە
لەگەڵ بۆنی شیری خاوا تێکەڵ دەبێ

کام لوتکەیە کام بەرزایی؟
پەنام بدەن ئەی کوانووە پڕ ئاگرەکان- ئەی کەوشەکانی بەختیاری
ئەی سروودی قاپی مسیی مۆبەق کاتی سڕینەوە
ئەی لەرزەی دڵگیری مەکینەی دروومان
ئەی جیدالی شەو و رۆژی فەرش و گسك
پەنام بدەن ئەی هەرچی عیشقی بێگەردو بەمشوورە
کە ئارەزووی پڕلە ئازاری مانەوە

جێنوێنی هەڵسوکەوتتان
بە ئاوی سیحرو دڵۆپی خوێنی تازە ڕەنگین دەکا

تەواوی رۆژ، تەواوی رۆژ
وێڵ وێڵ وەکوو لاشەی سەرئاو
بەرەو خەتەرترین گابەرد دەچوومە پێش
بەرەو قووڵترین ئەشکەوتی بنی دەریاو
گۆشت خۆرترین ماسییەکان
بڕبڕەی ناسکی پشتم
لە هەستی مەرگ ژان دەیهاتێ

نەم ئەتوانی، نەم ئەتوانی
لە رازی نەبوونی رێگا پێم دەنگی لێ بەرز دەبۆوە
نائومێدیم لە ئۆقرەی گیانم گەورەتر،
ئەو بەهارەش ئەو خەیاڵە کەسک ڕەنگە
کە بەبەر پەنجەرەکەدا تێ ئەپەری، ئەیگوت بەدڵ
" بروانە تۆ،
هەرگیز بۆ پێشەوە نەچووی
تۆ هەر رۆچووی."

******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## هەینی

هەینیی خامۆش

هەینیی تەریک

هەینیی خەماوی وەکوو کۆڵانی دێرین

هەینیی خەیاڵە نەخۆش و بێ تینەکان

هەینیی باوێشکە درێژ و بەژانەکان

هەینیی بە بێ چاوەڕاونی

هەینیی خۆبەدەستەوەدان

ماڵی چۆڵ و

ماڵی دڵگیر

ماڵی لەبەردەم هێرشی لاویدا دەرگا داخراو

ماڵی تاریکی و ئەندێشەی هەتاو

ماڵی تەنیایی و گەشبینی و گومان

ماڵی کتێب و ماڵی گەنجینەو پەردەو وێنەکان

ئاە چەند لەسەرخۆو بەویقار ڕۆیی،

ژیانی من وەک چۆمێکی نامۆ

لە ناخی ئەم هەینی یە خامۆش و بەجێماوانا

لەناو ئەم ماڵە چۆڵ و خۆشانا

ئاە چەند لەسەر خۆو بە ویقار ڕۆیی!

*****

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## لە ئاوابوونێکی ئەبەدیدا

-رۆژە یان شەو؟
- نەخێر هاورێ، ئاوابوونی ئەبەدی یە
لەگەڵ تێپەڕبوونی دوو کۆتر بەبادا
وەکوو دوو تابووتی سپی و
دەنگێک لەدوور، لەو پێ دەشتە نامۆیەوە
ناجێگیر و سەرلێشێواو بە وێنەی ڕێکردنی با

- پێویستە شتی بوترێ
پێویستە شتی بوترێ
بە نیازە دڵم لەگەڵ تاریکییا تێکەڵ بێ
پێویستە شتێ بوترێ

لەبیر چوونەوەیەکی چەندە سەنگینە
سێوێک لەچڵ دادەوەرێ
دەنکە تۆوی زەردی کەتان
لەژێر دەنووکی کەنارییە عاشقەکانی منا دەشکێن
گوڵی باقالا دەماری شینی لە مەستیی نەسیما
دەسپێرێ بە قوتاربوون لە دڵەراوکێی مەنگی گۆڕان
وە لێرەشا، لە منا ، لە سەری منا
ئاه..
لەسەری منا لە غەیری سووڕانی گەردی چڕی سوور شتێک نیە

نیگاشم وەك قسەی درۆ
شەرمەزارەو چاو بەرەو ژێر

-بیر لە مانگێك دەكەمەوە
-لە پیتی ناو هۆنراوەیەك
-لە كانییەك
-بیر لە خەیاڵێكی ناو خاك
-لە بۆنی تیژی پەڵەگەنم
-ئەفسانەی نان
-لە بێگوناهیی یارییەكان
-لەو كۆڵانە تەنگەو درێژ
كە پڕی لە بۆنی عەتری درەختانی ئەقاقی بوو
-لە هۆشیاربوونەوەی تاڵی پاشی یاری و
لەسەرسامیی ئەولای كۆڵان
لەو لاتری بۆنی عەتری ئەقاقییەكان

-ئازایەتی؟
-ئاه..
ئەسپەكان پیرن
-ئەوین؟
-تەنیایە و لە پەنجەرەیەكی نزمەوە
لە بیابانە بێ مەجنوونەكان دەروانێ
لە كۆڵانێك بەیادێكی پەشێوەوە
لەمەڕ لەنجەی پووزێكی ناسكی بەخرخاڵ

-ئارەزووەکان؟
-رێ ون دەکەن
لە هاوئاهەنگیی بێ بەزەییانەی هەزاران دەرگادا
-داخراوا؟
-بەڵێ هەمیشە داخراوی داخراو
-ماندوو دەبی

بیر لەیەک ماڵ دەکەمەوە
شێدار بەهەناسەی گوڵە پیچکەکانی
وەک گلێنەی چاو رۆشن بە چراکانی
لەشەوانیا تەمەڵ و بێ کەسەر، ڕاماو

لە کۆرپەیەک بە زەردەخەنەی بێ سنوور
وەکوو بازنەی پەی دەرپەیی شەپۆلی ئاو
جەستەیەکی پر لە خوێنیش وەکوو هێشوویەکی ئەنگوور

-من بیر لە وێرانە دەکەمەوە و
لە تالآنیی ڕەشەباکان
وە لە رووناکییەکی گومان لـێکراو
کە شەوانە لە پەنجەرەوە دەگەڕێ
وە لە گۆڕێکی بچکۆلە ، بچووک وەکوو جەستەی ساوا

-کار؟
-بەڵی بەڵام لەسەر ئەو مێزە گەورەیە

دوژمنێکی شاراوە لانەی کردووە
کە لەبۆ تۆ بەکاوەخۆ چاودەگێڕێ
هەروەک چۆن بۆ راستەو دەفتەر
بۆ هەزاران جۆرە شتی تری بێفەر
سەرەنجامیش تۆ لەناو کوپێ چاییا نوقم دەبی
وەکوو بەلەم لە گێژاوا
لە قوولایی ئاسۆشدا لە دووکەڵی خەستی جگەرەو
چەند هێڵێکی پەی پێ نەبراو بەولاوە
هیچ نابینی

-یەک ئەستێرە؟
-بەڵێ سەدان، سەدان بەلام
هەموو لەودیوی شەوانی تەنراوەوە
-یەک پەلەوەر؟
-بەڵێ سەدان، سەدان بەلام
هەموو لە ناو بیرەوەرییە دوورەکانا
بەغرووری باڵەفرەی بێهودەوە
-من لە بیری هاوارێکی ناو کۆڵانام
من لە بیری یەک مشکێکی بێ زیانام
کا جار بەجار بە دیوارا تێ دەپەرێ

پێویستە شتێ بوترێ
پێویستە شتێ بوترێ
دەمەو بەیانی لە ساتێکی لەرزۆکا

کە هەوا وەک هەستی  باڵقی

لەپڕ لەگەڵ شتێکی  نادیارا تێکەڵاو دەبێ

من حەز ئەکەم

خۆم تەسلیمی هەڵچوونێ کەم

من  حەز ئەکەم

لەو گەواڵە هەورە گەورەوە ببارێم

من  حەز ئەکەم

کە بڵێم نا، نانا، نانا

-با برۆین

-پێویستە شتی بوترێ

-پێک  یا ناوجێ، یاخود تەنیایی،  یانە خەو؟

-بابرۆین..

*******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## ژووانی شەو

وە دەموچاوێکی سەیر
لەودیوی پەنجەرەکەوە بەمنی وت
" ئەوە ڕاستە کە دەبینێ
من وەکوو هەستی ون بوویی ترسناکم
بەڵام خوایە
چۆن مومکینە لەمن ترسان؟
من کە هەرگیز
من کە غەیری کۆلارەیەکی سووکی وێڵ
بەسەر بانی تەم داگرتووی ئاسمانەوە
شتێ نەبووم
وە لە نامۆیی شەوانەی گۆرستانا
مشکێ بە ناوی مەرگەوە
عیشق و حەزو قین و ژانی کرتاندووومە"

وە دەموچاوە سەیرەکە
بەو هێڵە سستە باریک و درێژانەوە
کە سات بەسات ، با شێوەکەی ئێستایانی
لەبەین دەبردو دەگۆری
پرچی نەرم و درێژیشی
کە جووڵەی پەنهانیی شەو دەیڕفاندن و
بەگشت پانتایی شەوا پەخشی دەکردن

هەروەکوو گیای بنی دەریا
لەو دیوی پەنجەرەکەوە پەرێشان بوو
هاواری کرد
" باوەر بکەن
من زیندوو نیم"

من هێشتاکە لەپشت ئەوەوە دەمبینی
کۆڕی تاریکی و بەری زیویی سنەوبەر
ئاه بەلاّم ئەو..
بەسەر هەموو ئەمانەدا دەخلیسکاو
دڵی بێ کۆتاییشی دەچووە کەشکەشان
دەتوت کەوا هەستی سەوزی درەختانە
وە چاوەکانیشی هەتا ئەبەدیەت بڕیان دەکرد

تۆ ڕاست ئەکەی
من لەپاش مردنم هەرگیز
زاتم نەبووە کە ئاوێنە تەماشا کەم
هێندەش مردووم
کەوا ئیتر هیچ بابەتێ
مردنی من ناسەلمێنێ

ئاه
گویێت لەدەنگی سیسرکێ بوو
لە پەنای شەوا لەوپەڕی باخەکەوە

بەرەو لای مانگ هەڵ دەفڕێ؟
من لام وایە کەوا هەموو ئەستێرەکان
کۆچیان لەبۆ ئاسمانێکی ون کردووە
وە شاریش، شار چەند بێ دەنگ بوو!
من بە درێژایی ڕێگای خۆم
بێجگە لەچەند پەیکەرێکی ڕەنگ پەریوو
چەند کەناسێ
کە بۆنی خۆڵ و تووتنیان لێوە دەهات
وە چەند حەسحەسێکی ماندووی چاو خەواڵوو
هیچی ترم نەهاتە ڕێ

ئەفسووس
من مردووم و شەویش ئەڵێی
هەر ئیدامەی هەمان شەوی بێهودەیە

کوژایەوە و
شاڵاوی گریان پانتایی فراوانی دووچاوانی
تەڵخ و لێڵ کرد
" ئایا ئێوە کە سیماتان
لە سێبەری چارشێوی خەمناکی ژینا
شاردۆتەوە؟
جار جار بیر لەم حەقیقەتە هیوا بڕە دەکەنەوە
کە زیندووەکانی ئەمرۆ
تەنیا تڵپی زیندوون و بەس؟

وەک منداڵێ
لەگەڵ یەکەم پێکەنینیا پیر بووبێت و
دڵیش- ئەم بەردەنووسە رووشاوە
کە دەسکاریی نووسینەکانی کراوە-
چیتر باوەڕ بە ئیعتیباری بەردێتی خۆی ناکا هەر

رەنگە ئیدمان بوون بە وجوود
وە مەسرەفی بەردەوامی ژان برِەکان
ئارەزووە پاک وسادەکانی مرۆڤی
بە گێژەنی زەوال دابێ
رەنگە گیانیان
بۆ خەڵوەتی دورگەیەکی کەس لێ نەبوو
وە دوور نابێ
ڕەنگە دەنگی سیسرکەکەم بە خەو دیبێ

کەوابێ ئەم پیادانەی کە وا بە سەبر
پاڵیان داوەبە رِمە دارینەکانی خۆیانەوە
ئەو سوارانەن کە ئەسپی تیژرِەو دەئاژۆن!
ئەم پەرپووتە ترياكی یە چەماوانەش!
ئەو پیاو چاکە بێ وەیانەن کە خەمی داهاتوو دەخۆن!
ئەگەر وابێ ڕاستە، ڕاستە کەوا مرۆڤ
چاوەڕوانی سەرهەڵدانی پەیامبەرانی تر نیە
کەنیشکە عاشقەکانیش

چاوی خۆشباوەڕی خۆیان بە دەرزیی نەخش هەڵ دڕیوە

ئێستا سەدای  قەلە ڕەشەکان
لەناخی خەونەکانی دەمەو بەیاندا
دەبیسترێ
ئاوێنەکان دێنەوە هۆش
تەنیاکانیش
خۆیان بە یەکەم نیشانەی بێداربوون و
بە هێرشی نادیاری مۆتەکەی شووم
تەسلیم دەکەن

ئەفسووس کە من
بەگشت یادگارەکانمەوە
لە خوێن، کە بەس باس لە بەزمی خۆێناوی بوو
وە لە غروور ، ئەو غروورەی  کە هیچ کاتێ
ئا بەوجۆرە سووک نەدەژیا
لە کۆتایی هەلی خۆما ڕاوەستاوم
وە گوێ دەگرم، نەهیچ  دەنگێ
ڕادەمێنم، نە بزووتنی  گەڵایێ
ناوی منیش کەهەناسەی ئەو هەموو پاکژییە بوو
"چیتر  هەتا تۆزی  گۆڕیش
هەڵ ناسێنێ"

لەرز گرتی

وە بەهەردوو دیوی خۆیا ڕۆچووە خوار
وە لە درزەكانیشەوە دەستی تكای
وەكوو ئاهی درێژ بەرەو
لای من كشان

" سەرمایەو با
هێڵەكانی من دەبڕێ
ئایا هێشتا لەم هەوارە كەسێ ماوە
لە بینینی دەموچاوی فەنابووی خۆی
ترسی نەبێ؟
كاتی ئەوە نەهاتووە
كە ئەم دەرگا بكرێتەوە ، واز،واز ،واز
كە ئاسمان دابكات و
مرۆڤ بەسەر لاشەی مردووی
خۆیا زار زار نوێژ بخوێنێ؟"

ڕەنگە ناڵەی تەیر بووبێ
یاخود بای بەینی درەختان
یاخود خۆم بووم لەبەرامبەر گرێكوێرەی دڵی خۆما
وەكوو شەپۆلی حەسرەت و شەرم و ئازار
هەڵ دەكشام
لەپەنجەرەشەوە دەمدی
ئەو دوو دەستە ، ئەو دوو سەرزەنشتە تاڵە
كە هەروا بەرەو دەستی من درێژ بووبوون

لە ڕووناکی سپێدەیەکی درۆدا

دەتوانەوە

وە دەنگێکیش  کە لەدەم  ئاسۆی ساردەوە

هاواری کرد:

" خودا حافیز"

*****

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## پەنجەرە

یەك پەنجەرە لەبۆ دیتن
یەك پەنجەرە لەبۆ بیستن
یەك پەنجەرە كە بەوێنەی ئەڵقەی بیرێك
لە قووڵایی خۆیدا دەگا بە دڵی خاك
وە بەرووی ئەم پانتایی یە میهرەبانە پەی دەرپەیە شین رەنگەدا
دەكرێتەوە
پەنجەرەیەك كە دەستە بچكۆلەكانی تەنیایی لە
لە بەخششی شەوانەی عەتری ئەستێرە بەخشندەكان
لێوان دەكا
وە دەشكرێ هەر لەوێوە
هەتاو بكرێتە میوانی نامۆیی گوڵی شەمدانی
بۆ من یەك پەنجەرە بەسە

من لە شاری بووكەشووشەكانەوە دێم
لە ژێر سێبەری درەختی كاغەزەوە
لە ناو باخی كتێبێكی رەنگاورەنگا
لەوەرزی وشكی ئەزموونە بێ ئەنجامەكانی ئەوین و دۆستی یا
لە كۆڵانە خاكییەكانی پاكییا
لەساڵەكانی كامڵ بوونی پیتە بێ ڕەنگەكانی ئەلفبادا
لەسەر كورسییەكانی قوتابخانەیەكی سیلاوی
لە ساتێكا كە منداڵەكان توانییان

لە سەر تەختە وشەی " بەرد" بنووسن و
ریشۆڵە سەرسامەكانیش كۆنە درەختیان بەجێ هێشت

من لە نێوان رەگوریشەی رووەكی گۆشتخۆرەوە دێم
مێشكم هێشتا
پڕ لە دەنگی ترسی ئەو پەروانانە بوو
كە بە دەرزی
لە دووتوێی  دەفتەرێكدا لە خاچ درابوون

كاتێ كە ئیعتیمادی من هەڵواسرابوو بە پەتی ناسكی عەدالەتاو
لەگشت شارا
دڵی چراكانمیان پارچە پارچە دەكرد
كاتێ كە چاوی منداڵانەی عیشقی منیان
بەدەسرِی تاریكی یاسا دەبەست و
لە لاجانگی پەشێوی ئارەزوومەوە
فوارەی خوێن هەڵ دەقولاّ
كاتێ كە چیتر ژیانم
شتێ نەبوو، شتێ نەبوو غەیری تیكتاكی كاتژمێری دیواری
لە بۆم دەركەوت كە دەبیّ، دەبێ ، كەدەبێ
وەكوو دێوانە عاشق بم

یەك پەنجەرە بۆ من بەسە
یەك پەنجەرە بۆ سەر ساتی هۆشیاری و نیگاو بێ دەنگی
ئێستاكە نەمامی دارگوێز

ئەوەندە هەڵ کشاوە کە گەڵا ناسکەکانی لە دیوار تێ بگەن
لە ئاوێنە پرسیار بکە
ناوی ڕزگارکەرەکەی خۆت
ئایا  زەوی کە لەژێر پێتا دەلەرزێ
لە تۆ زیاتر تەنیا نیە؟
پێغەمبەران لەگەڵ خۆیان
پەیامی وێرانییان بۆ ئەم سەدەیەی ئێمە هانی؟
ئەم تەقینە پەی دەر پەیەی
ئەم هەورە ژەهراوییانە
ئایا سەدای ئایەتە پیرۆزەکانن؟

ئەی هاورێ ، ئەی برا ، ئەی هاوخوێن
کاتێ دەگەی بە مانگ
مێژووی کوشتاری  گوڵەکان بنووسەوە
خەونەکانیشمان هەمیشە
لەهەڵەمووتی سادەیی خۆیانەوە هەڵ دەدێرێن و دەمرن
من شەوەرێکی چوارپەلك بۆن ئەکەم کە،
لەسەر گۆڕی چەمکە کۆنەکان ڕوواوە
ئەو ئافرەتەی کە لەکفنی چاوەڕوانی و پاکیی خۆیا نرایە چاڵ،
ئاخۆ من بووم؟
بڵێی دیسان بە پەیژەی فزووڵی خۆما بچمە بان
تا سلاو کەم لە خوای گەورە کە لەسەر بان هەنگاو دەنێ؟

وا هەست ئەکەم  کات ڕۆیوە

وا هەست ئەکەم " سات" بەشی منە لە لاپەرەکانی مێژوو
وا هەست ئەکەم مێز مەودایەکی درۆیە لەنێوانی پرچی من و
دەستەکانی ئەم نامۆیە خەمگرتووا

قسەیەکم لەگەڵ بکە
ئەوکەسەی کە میهرەبانیی جەستەیەکی زیندووت ، مەگەر، پێ
دەبەخشێ
لە ئیدراکی هەستی زیندوو بوون زێدەتر چی لێت دەوێ؟

قسەیەکم لەگەڵ بکە
من لەلای پەنجەرەکەدام
لەگەڵ هەتاو هاوپەیوەندم

*****

کۆمەڵە هۆنراوەی باوەر بێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما

## دیاری

باس لە  کۆتایی شەو ئەکەم
باس لە کۆتایی تاریکی و
باس لە کۆتایی شەو ئەکەم

ئەی میهرەبان گەر بۆ لای من هاتی چرام لە بۆ بێنەو
دەلاقەیەك
هەتا لێوەی  لە بەزمی کۆلانی بەختەوەر بڕوانم

******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## دڵم بە باخچە ئەسووتێ

کەس لە بیری گوڵەکانا نیە
کەس لە بیری ماسییەکانا نیە
هیچ کەس نایەوێ
باوەڕکا  باخچە خەریکە دەمرێ
کە دڵی باخچە لەبەر هەتاوا هەڵ ئاوساوە
کە مێشکی باخچە وا وردە وردە
لە یادگەلی سەوز پاک ئەبێتەوە
یا هەستی باخچە وەک شتێکی ڕووت
لە تەنیایی باخچەدا گەنیوە
حەوشەکەی ماڵی ئێمە تەنیایە
حەوشەکەی ماڵمان
لە چاوەڕوانی بارینی هەورێکی نەناسیاوا
باوێشک ئەدا
حەوزەکەی ماڵمان ئاوی تیا نیەو
ئەستێرەگەلی گچکەی بێ ئەزموون
لەقەد بەرزایی دارەکانەوە
دەکەونە خوارێ
لە پەنجەرە رەنگ پەڕیوەکانی ماڵی ماسییان
شەوان دەنگی کۆکە دێتە بەرگوێ
حەوشەکەی ماڵی ئێمە تەنیایە

باوکمان ئەڵێ

"من دەورم تەواو

من دەورم تەواو

من باری خۆمم تەواو بردووە

من کاری خۆمم تەواو کردووە"

لە ژوورەکەیا بەیانی تا شەو

دەخوێنێتەوە

"شانامە" یا "ناسخ التواریخ"

بە دایکم دەڵێ

"نەفرین لە هەموو ماسی و پەلەوەر

کە بمرم ئەمن

گەر باخچە هەبێ یا باخچە نەبێ

فەرقی چی دەبێ

مووچەی خانەنشینی بەسە بۆ من"

ئەوەتی هەیە

دایکم بەرماڵێکی ڕاخراوە

لەبەر دەرگاکەی ترسی دۆزەخا

لە ناو هەموو کێشەیەکا دایکم

لە دووی شوێن پێی گوناهێ دەگەرێ

لای وایە باخچەش

کفری گیایەک ئالوودەی کردووە

دایکم هەمیشە دووعا ئەخوێنێ

دایکم گوناهباری سروشتی یە

فوو ئەکا بەسەر گشت گوڵەکانا

فوو ئەکا بەسەر ماسییەکانا

فوو ئەکا لەخۆی

دایکم چاوەڕێی سەرهەڵدانێکە

وە بەخشینێکە کە دێتەخوارێ

براکەم بە باخ ئەڵێ گۆڕستان

بە سیس بوونی گیا پێکەنینی دێ

ئەیانژمێرێ لاشەی  ماسییەکان

کەلەژێر پێستی  نەخۆشی ئاوا

شی دەبنەوە بۆ گەردی گەنیو

براکەم  ئەوداڵی فەلسەفەیە

لای براکەم چاکبوونەوەی باخچە

تەنیا بە تێکدانی باخچەکەیە

ئەو وەك سەرخۆشە

مشتی ئەماڵێ بە دارو دیوار

ئەیەوێ بڵێ

زۆر نائومێدەو ماندوو و دەردەدار

نائومێدییەکەی

وەکو ناسنامەو دەسرۆ تەقویم و چەرخ و قەڵەمی

لەگەڵ خۆی دەبا بۆ کووچەو بازار

نائومێدییەکەی هێندە بچووکە

لە قەرەباڵغی مەیخانەکانا

هەر شەو ون دەبێ

خوشکیشم دۆستی گوڵان بوو، کاتێ
دایکم لـێی دەدا
قسەی ساکاری دڵی خۆی دەبرد
بۆ کۆری خامۆش و میهرەبانیان
جارجارەش دەستەی ماسییەکانی
داوەتی شیرینی و هەتاو دەکرد
ئەو ئێستا ماڵی لەوپەڕی شارە
لەناو خانووە دەست کردەکەیدا
لە پەنا عیشقی مێردی دەسکردی و
لەژێر لق و پۆی درەختی سێوی دەسکردا لەگەڵ
ماسییە سوورە دەسکردەکانیا
گۆرانی گەلی دەستکرد دەخوێنێ و
منداڵی سروشتی دروست ئەکا
ئەو هەرکاتێ کە
دێ بۆ لای ئێمە
چمکی تەنوورەی لە هەژاریی باخچەدا پیس ئەبێ
بە قوڵەنیا خۆی پاک دەکاتەوە
ئەو هەر کاتێ کە بۆ لای ئێمە دێ
دووگیانە

حەوشەکەی ماڵی ئێمە تەنیایە
حەوشەکەی ماڵی ئێمە تەنیایە
بە درێژایی رۆژ
دەنگی وردبوون و تەقینەوە دێ

دراوسێکانمان لە ناو باخچەدا لە جیاتی گوڵ

گشتیان هاوەن و شەستیر دەنێژن

گشت هاوسێکانمان بەسەر حەوزی کاشیی حەوشەیانا

سەرقاپ دائەنێن

حەوزە کاشی یەکان بێ ویستی خۆیان

بوون بە ئامباری شاراوەی  باروود

منداڵەکانی کۆڵانی ئێمە گشت جانتاکانیان

پڕ لە قومبەلەی بچووك کردووە

حەوشەکەی ماڵی ئێمە گێژ بووە

من لە زەمانێك

ئەترسم دڵی خۆی ون کردووە

من لە خەیاڵی بێهودەیی ئەم هەموو دەستانە

لە بەرجەستە بوونی بێگانەیی ئەم هەموو دەموچاوە ئەترسم

وەك ئەو قوتابییەی

شێتانە حەزی لە وانەی ئەندازەیە من تەنیام

لەو باوەرەشدام ئەکرێ باخ ببرێ بۆ نەخۆشخانە

لەو باوەرەدام

لەو باوەرەدام

لەو باوەرەدام

دڵی باخچەکە لە بەر هەتاوا هەڵ ئاوساوە

مێشکی باخچەکەش وا ئارام ئارام

لە یادی  کەسك پاك ئەبێتەوە

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## لـێی ببورن

لـێی ببورن
ئەو کە جارجار
پەیوەست بوونی پر ئازاری وجوودی خۆی
بە ئاوی پەنگ خواردووەوە و
بە چاڵە بۆشەکانەوە لەبیر ئەکا
وە گێلانە وا دەزانێ
کە مافی ژیانی هەیە

لـێی ببورن
لە تووڕەبوونی بێ مەبەستی وێنەیەك
کە ئارەزووی دووری جووڵە
لەچاوە کاغەزییەکانیا دەبێ بە ئاو

لـێی ببورن
لەو کە سەراپای تابووتی
پڕ لە ڕەوتی سووری مانگەو
عەترە بزێوەکانی شەو
خەوی هەزاران ساڵەی ئەندامەکانی
پەشێو دەکەن

لـێی ببورن

لەو کەوا لە ناخیەوە هەڵوەشاوە

بەڵام هێشتا پێستی چاوی لە خەیاڵی رۆشنایی یا دەکزێتەوەو

پرچە بێ هیواکانیشی

نائومێدانە بۆ شالاوی هەناسەی عیشق ئەلەرزن

ئەی خەڵکی سەرزەمینی سادەی بەختیاری

ئەی هاودەمانی پەنجەرەی کراوە بە ڕووی بارانا

لـێی ببورن

لـێی ببورن

چونکە ئەو خەیالاوییە

چونکە رەگوریشەی  وجوودی پڕ لە بەرهەمی ئێوە

لە ژێر خاکی نامۆی ئەوا تازە بە تازە مل دەنێن

دڵە خۆش باوەڕەکەشی

بە گورزی پرژانی حەسرەت

لە گۆشەی سینەیا هەڵ دەئاوسێنن

*******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## پرسیار

سڵاو ماسییەکان، سڵاو ماسییەکان

سڵاو سوورەکان، سەوزەکان، زێرینەکان

پێم بڵێن ئاخۆ لە ناو ئەو ژوورە کریستاڵەدا

سارد وەک بیلبیلەی چاوی مردووان

وە وەک کۆتایی شەوی شارەکان کپ و داخراو

گوێتان لە دەنگی جووزەلەیەک بووە

کە لە شاری پەرییەکانی ترس و تەنیایی یەوە

بەرەو ئیعتیمادی خشتینی ژووری نووستنەکان

وە لایە لایەی قورمیش کراوی سەعاتەکان و

گەردە ناسکە شووشەیی یەکانی رۆشنایی تەکان دەدا؟

وە لەگەڵ تەکان دانیا

ئەستێرە تاجییەکان لە ئاسمانەوە بەردەبنە سەر زەوی

دڵە بچووکە بزێوەکانیش

لە دەست شاڵاوی گریان دەتەقن

******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## لە تاریکییا

لە تاریکی یا
بانگم لـێ کردی
بێ دەنگ بوو و شنە،
پەردەی لادەدا
لە ئاسمانی مات
دەگڕا ئەستێرەو
دەرۆشت ئەستێرەو
دەمرد ئەستێرە
بانگم لـێ کردی
بانگم لـێکردی
هەموو وجوودم
وەک پیاڵەیەک شیر
لە ناو دەستما بوو
نیگای سپیی مانگ
دەیدا لە شووشە

سترانێکی پەست
بەرز دەبۆوە وەکوو دودمان
لە شاری سیسرک
وەک دووکەڵ دەخزا
بەسەر پەنجەرا

پاکی شەو لەوێ
لە سینەی منا
لە نائومێدی
یەکێ دەناڵی
یەکێ هەڵ دەستا
یەکێ تۆی دەویست
دوو دەستی ساردیش
ڕێگەی لـێ دەگرت

پاکی شەو لەوێ
چڵە ڕەشەکان
خەمیان دەباران
یەکێ پەشێو بوو
گازی تۆی دەکرد
وەك دارو پەردوو
هەواش بە ڕوویا دەڕمایە خوارێ

درەختە گچکەکەم
عاشقی بابوو
بای بێ ناونیشان
کوانێ ماڵی با؟
کوانێ ماڵی با.

***

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## لە ئاوە سەوزەکانی هاوینا

تەنیا تر لە گەڵایەک
بە کۆڵی شادییە کۆچ کردووەکانمەوە
لە ئاوە سەوزەکانی هاوینا
لەسەر خۆ دەرۆم
تا وڵاتی مەرگ
تا کەناری خەمە پاییزییەکان
لە سێبەرێکا پاڵم دایەوە
لە سێبەری بێ ئەنجامی عیشقا
لە سێبەری کاتیی بەختیارییا
لە سێبەری بێ بە قایی یەکانا

کە نەسیمی گێژ شەوان هەڵ دەکا
بە ناو ئاسمانی کورتی دڵ تەنگا
کە مانگی خوێنین شەوان رێ دەکا
بە کۆڵانە شینەکانی دەمارا
شەوان کە تەنیاین
لەگەڵ لەرزینی گیانمانا، تەنیا-
دەجۆشێ بەدەم ترپەی دڵەوە
هەستی هەبوونمان، هەبوونی نەخۆش

" لە چاوەروانی دۆڵەکاندا یەک نهێنی هەیە"

که بەسەر لوتکەی کێوەکانەوە
لەسەر گابەردەکان هەڵ کەندراوە
کە لە رەوتی کەوتنە خوارەوەدا
شەوێك خامۆشی کوێستانەکانیان
لە خواستێکی ناخۆش ئاخنی بوو

" لە پەشێویی دەستە پڕەکانا
ئارامیی دەستانی خاڵی نیە
بێدەنگی وێرانەکان جوانە"
ئافرەتێك لە ناو ئاوەکاندا ئەم گۆرانی یەی دەوت
لە ئاوە سەوزەکانی هاوینا
وەك بڵێی لە وێرانەدا بژی

بە هەناسەمان
ئێمە یەکتری ئالوودە دەکەین
ئالوودە بە تەقوای بەختەوەری
ئێمە لە دەنگی هەوا دەترسین
لە شالاوی سێبەری دوودڵی
بۆ باخی ماچمان، رەنگمان تێك دەچێ
ئێمە لە هەموو میوانییەکانی تەلاری نوورا
لە ترسی رووخان گیانمان دەلەرزێ

ئێستا تۆ لێرەی
بەربلاو وەکوو عەتری ئەقاقی

لە کۆڵانەکانی بەیانییا
قورس لەسەر سینەم
لە دەستما داغ
لە پرچەکانما مەست ، سووتاو، بێهۆش
ئێستا تۆ لێرەی

شتێکی زۆرو تاریک و گەورە
شتێکی پەشێو وەک دەنگی دەست پێنەگەیوی رۆژ
بەسەر بیلبیلەی پەرێشانمدا
دەگەرێ و خۆی بڵاودەکاتەوە
ئەڵێی من لەسەرچاوەکەم دەگرن
ئەڵێی من لە لاسکەکەم دەچنن
ئەڵێی دام دەخەن وەک دەرگا بەسەر ساتەکانی تری داهاتوودا
ئەڵێی..
چیتر نابینم

لەسەر خاکێکی بێ پیت رووناوین
لەسەر خاکێکی بێ پیت دەبارێین
ئێمە " هیچ" مان لەسەر رێگەمان دی
بەسواری ئەسپە زەردە باڵدارەکەی خۆی
وەک پاشا رێگەی دەبڕی

حەیف ئێمە بەختیار و ئارامین
حەیف ئێمە دڵتەنگ و بێدەنگین

بەختەوەر چونکە خۆشمان دەوێ

دڵتەنگیش چونکە ئەوین نەفرینە

******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## بووکەشووشەی قورمیشی

لەوەش زیاتر ، ئاه ، بەڵێ
لەوەش زیاتر ئەتوانی بێ دەنگ بی

ئەتوانی چەندین سەعات
بە نیگایەک وەکوو نیگای مردوو نەگۆڕ
لە دووکەڵی جگەرەیەک رابمێنی
لە شێوەی یەک دانە فنجان رابمێنی
لە گوڵی بێگیانی قاڵی
لە هێڵی وەهمیی سەر دیوار
ئەتوانی بە پەنجەی وشک
پەردە لادەیت و ببینی

لە ناو کۆڵان بارانێکی توند ئەبارێ
منداڵێ بە کۆلارە رەنگاورەنگەکانیەوە
لە ژێر تاقێکا وەستاوە
عەرەبانەیەکی رزیو بەپەلەیەو بە جەنجاڵی
گۆرەپانی چۆڵ جێدێڵێ
ئەتوانی لە شوێنێکا بمێنیتەوە
لە کەناری پەردەکەدا، بەلاّم کەڕ، بەلاّم کوێر
ئەتوانی بەرز هاوار کەی
بە دەنگێکی زۆر ساختەیی و زۆر بێگانە

" خۆشم دەوێی"

بە زیرەکی خۆت ئەتوانی مل کەچ بکەی
هەرچی مەتەڵی گرانە
بە تەنیایی ئەتوانی خشتەیەک حەل کەی
ئەتوانی بەدۆزینەوەی وەڵامێکی پروپووچیش دڵت خۆشکەی
وەڵامێکی پروپووچی پێنج شەش پیتی

بە درێژایی تەمەن ئەتوانی چۆک دادەی
بەسەرێکی کزەوە لە پەنا مەرقەدێکی ساردا

لە گۆڕێکی نادیارا ئەتوانی یەزدان ببینی
ئەتوانی بە پارەیەکی ئاسن ئیمان بەدەست بێنی
ئەتوانی لە کونجی مزگەوتا بگەنێی
وەکوو زیارەتنامە خوێنەرێکی پیر

وەکوو سفر لە لێکدان و کۆو دەرکردن
ئەتوانی بەردەوام یەک ئەنجامت هەبێ
ئەتوانی چاوی تۆ لەقۆزاخەی ژینا
وەکوو دوگمەی سواوی کەوشێکی کۆنە سەیر بکەی
ئەتوانی وەک ئاو لەناو چاڵاوی خۆتا وشک ببی
ئەتوانی جوانیی یەک لەحزە بە شەرمەوە
وەک وێنەیەکی رەشی فەوریی ناشیرین
لە بنی سندووقەکەتدا بشاریەوە

ئەتوانی لە چوارچێوەی خاڵیی رۆژێکا

وێنەی مەحکوومێک یابەزیوێک یا لەخاچ دراوێک هەڵبواسی

ئەتوانی بە دەمامک درزی دیوارەکەت  داپۆشی

ئەتوانی تێکەڵی دەوری پووچتر ببی

ئەتوانی وەک بووکە شووشەی قورمیشی بی

بە دووچاوی شووشە دنیای خۆت ببینی

ئەتوانی لە ناو بەرگی قەیفەدا

بە جەستەی پڕی پووشەوە

بۆ ساڵەها لە پەنا تۆرو پوولەکەدا بخەوی

ئەتوانی لەگەڵ گوشینی هەرزەکارانەی هەردەستێ

بێ هۆ هاوار کەیت و بلـێی

" ئاه، من چەند بەختەوەرم"

******

کۆمەڵە هۆنراوەی لەدایکبوونێکی تر

## باڵندە تەنیا باڵندە بوو

باڵندە وتی" چ بۆنێکە ئاه..، چ هەتاوێکە
بە هار هاتووە و
منیش دەکەومە دوای هاوجووتی خۆم"

باڵندە لەسەر هەیوانەکەوە وەکوو پەیامێ هەڵفری و ڕۆیی

باڵندە ورد بوو
باڵندە بیری نەدەکردەوە
باڵندە ڕۆژنامەی سەیر نەدەکرد
باڵندە قەزری کەسی لانەبوو
باڵندە مرۆڤی نەدەناسی

باڵندە دەفڕی
بە ئاسمانا
بەسەر گڵۆپە ترسناکەکانا
لە بەرزییەکی زۆرا دەفڕی
وەکوو شێت، ساتە شینەکانی تاقی دەکردەوە

باڵندە ، ئاه، تەنیا باڵندە بوو

*******

کۆمەڵە هۆنراوەی باوەر بێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما

## باڵندە دەمرێ

دڵم گیراوە
دڵم گیراوە

ئەچمە هەیوان و سەرپەنجەکانم
بەسەر رووی پێستی هەڵکشاوی شەودا دەهێنم
چراکانی پەیوەندی تاریکن
چراکانی پەیوەندی تاریکن

هیچ کەسێ من بە
خۆر ناناسێنێ
کەس بۆ میوانی چۆڵەکەم نابا
فڕین یادت بێ
باڵندە دەمرێ

*******

کۆمەڵە هۆنراوەی باوەر بێنین بە سەرەتای وەرزی سەرما

یەک پەنجەرە لەبۆ دیتن




# A Lonely Woman

***The Life***
***and Selected Poems of***

**Forough Farrukhzad**

***Translated by***
**Dr Nasih Qeredaxi**

**Erbil 2001**